# نهێنییەکانی

# سێگۆشەی بەرمۆدا

نوسینی

د.جەزا تۆفیق تالب    ئەحمد عەلی ئەحمد



2010

*ناوی کتێب : نهێنییەکانی سێگۆشەی بەرمۆدا
* دانەر : جەزا تۆفیق تالیب – ئەحمد عەلی ئەحمد
* تیراژ ( ١٥٠٠ ) دانە
* تایپ : ڕەهێڵ ئەحمەد
* لە بڵاوکراوەکانی چاپەمەنی و نوغسێتی دیلان
* ژمارەی سپاردن : ( ٣٨٩ )

# پێشەکی:

ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا و دیارنەمانی پاپۆڕ و فڕۆکە تێیدا ، بۆتە بابەتێکی سەرنج ڕاکێش و سەرسوڕهێن و مەتەڵئاسا ، نەك هەر لەناو کۆمەلانی گشتی خەڵکدا ، بەڵکو لە ناوەندە زانست و سەربازی ، دەزگا ڕەسمی و دەوڵەتیەکانیشدا ، لەناوەندەکانی خوێندن و قۆناغە جیاوازەکاندا پرسیار و گفتوگۆ و مشتومڕی لەسەر دروست دەبێت :

بەشدارانی ئەو جۆرە گفتوگۆیانە ، زۆرینەی جارەکان دەبنە دوو بەشەوە ، بەشێکیان دیاردەکان بەڕاستی و دروستی و نامۆ و سەرسوڕهێنەر دەزانن ، هەوڵ دەدەن هۆکاری زانستییانەی پەسەند و گونجاوی بدۆزنەوە ، ئەگەر تەواویش نەپێکن ، بەشەکەی تر هەرلەبناغەیەوە باوەڕیان بە سەیر و نامۆیی دیاردەکان نییە ، بەڵکو بەڕووداوی ڕۆژانەی ئاسایی لە قەڵەمیدەدەن و هیچ نامۆی و سەرسوڕمانێك لە ڕووداوەکاندا نابینن ، هەڵبەتە ئەمانەیش پاساوی خۆیان هەیە .

ئەوەندەی ئێمە ئاگامان لێبێت هەتا ئێستا بەزمانی کوردی کتێبێك ، یان لێکۆڵینەوەیەکی بەربلاوی هەمەلایەنە لەسەر ئەم دیاردانە بلاْونەکراوەتەوە ، ئەوەی هەتا ئێستا لەبەردەستدایە ، هەندێ بابەتی کەمو کوڕ و بەرتەسکن ، کە لەسەر لا پەڕەی گۆڤار و ڕۆژنامەکان بەرچاودەکەون ، ئەمانەش ئارەزووی خوێنەر و خواستەکانی تێر ناکەن ، ئەمە هۆیەکی گەورە بوو وای لە ئێمە کرد ئەم کارە ئەنجام بدەین ، بەو هیوایەی تونیبیتمان وەلاْمی بەشێکی زۆری ئەو پرسیارانەمان دابێتەوە کە بەلای خوێنەرەوە مەبەستە و کەلێنێکی زۆر بچوکی کتێبخانەی کوردیشمان پێپڕکردبێتەوە ، کەواتە بەلای ئێمەوە مەبەستە مەعریفیەکە مەبەستی یەکەمە ، نەك گەڕان بەدوای هۆکارە ڕاستەقینەکانی دیاردەکاندا ، چونکە ئەوە کارێکی زۆر گرانەو و نەك هەر لەتوانای ئێمەدا نیە

بەڵکو دەزگا زانستی و دامەزراوە سەربازییە گەورەکانی جیهانیش ، هەتا ئێستا ئەم کارەیان پێنەنجام نەدراوە ، گەرنا ، بۆچی ئاوا بە نامۆ و سەرسوڕهێن دەمایەوە ، بە پێویستی دەزانین لەم پێشەکیەدا ئاماژە بۆ خاڵێکی گرنگ بکەین ، ئەویش ئەوەیە ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا دیارە نامۆکانی ناوی ، تەنها دیاردەی نامۆ و سەرسوڕهێن نین لە جیهاندا ، کە هەتا ئێستا نەتوانرابێت لێکدانەوەی زانستیان بۆ بکرێت ، ژمارەیەکی زۆر ڕووداى تریش هەن کە ئەوانیش لێکدانەوەی زانستی و بەڵگەی حاشا هەڵنەگریان نییە ، لەوانە دیاردەکانی پاراسایکۆلۆجی ، ئەهرامەکانی میسر و ئەفرەتی فیرعەونەکان ، شوێنی فڕۆکەخانە کۆنەکەی وڵاتی پیرۆ ، نووسراوە سەنسکریتییە کۆنەکان ، دەیان لەو ئەفسانە و چیرۆکانەی کە هێندییە سوورەکان و تیرە سەرەتاییەکانی ئەفریقا و ئەمریکای لاتینی ، .. هتد ،
ئەمانە هەموویان دیاردەن و ڕوودەدەن ، دەبینرێن ، دەبیسرێن ، دووبارە و چەندبارە دەبنەوە بەلام تاکو ئێستا لێکدانەوەی زانستیان بۆ نەکراوە ، بۆیە خراونەتە خانەی پشتگوێ خوێ خستن و ئەفسانە و خەیاڵەوە
ئەوەش جێبەجێکردنی ئەو ڕیسا ساکار و کۆوکاڵەیە کە دەڵێت :
( ئەوەی نەتوانی لێکیبدەیتەوە پیشتگوێ خستن بخە ) : بەلام پێمان وایە ئەوە چارەسەری کێشەکان ناکات ، لە ڕاستیدا ڕووداو و دیاردەکان کەمناکاتەوە ، بەڵکو بە پیچەوانەوە توانای گەڕان و پشکنین و توێژینەوە لاواز دەکات ودەرگاکانی داهێنان و پێشکەوتن دادەخات .
هیوادارین ئەم کتێبە لەناو کتێبخانەکانی کوردیدا جیگای خۆی بکاتەوە و خزمەتێکی کەمیش پێشکەش بە خوێنەران بکات .

ئەحمد عەلی ئەحمد　　　　جەزا تۆفیق تالب

# پێرستی بابەتەکان

بەشی چوارەم

ناوچەی سەرسوڕهێنەر و نامۆکانی تری جیهان .

باسی یەکەم/ ئەو ناوچانە کامانەن ؟

باسی دووەم/ کورتەباسێك دەربارەی دەریاری شەیتان .

بەشی پێنجەم

هۆیەکان و دیارنەمان و بزربوونی پاپۆڕ و فرۆکەکان لەناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدادا .

پێشەکی/

باسی یەکەم/ ڕای ئەوانەی پشتگیری لە دیاردەکە دەکەن و هەوڵدەدەن لێکدانەوەی زانستی بۆ بکەن .

یەکەم/ هۆکارە سروشتیەکان

١. شەپۆلەکانی هەڵکشان و داکشان – موجات المد والمجزر.

٢. تەوژمی کەنداو ( تیار الخلیج )

٣. تەوژمە هەواییەکان ( التیارات الهوائیە )

٤. بیردۆزەکەی ئیڤان ساندرسن.

٥. کایەی مۆگناتیسی.

٦. بیردۆزی یەك بواری لای ئەنشتاین.

٧. ڕای ژمارەیەك لە زانا ڕووسیەکان.

دووەم /هۆکارە مرۆییەکان

پێشەکی/

١. تەنە فڕیوەکان ( الاجسام طائرە )

٢. ئەو شوێنانەی تەنە فڕیوەکانی لێوەدێت .

أ لە گۆی زەویەوە :

١. جیهانی تر لە ژێر زەویدا .

٢. جیهانی ژێر ئاوی زەریاکان.

ب. لەدەرەوەی گۆی زەوییەوە ( لە بۆشاییەوە ).

٣. ئەو تەنە فڕیوانە بۆ چ مەبەستێک دێنە سەرگۆی زەوی ،

٤.دەشێ ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا بنکەیەکی سەربازی ، یان سیخوڕییێت ؟

باسی دووەم / ڕای ئەوانەی هەرلەبناغەدا باوەڕیانبەناموٚیی دیاردەکان نییە .

بەشی شەشەم

هەندێک دیاردەی پەیوەندی دار بەسێگۆشەی بەرمۆداوە .

باسی یەکەم/ تاقیکردنەوەکەی فلادفیا.

باسی دووەم/ بیرۆکەی کلۆرێتی زەوی – فکرة الارض الجوفاء

باسی سێیەم / ئەتلانتس ، یان کیشوەرە بزربووەکە .

لیستی سەرچاوەکان .

## بەشی یەکەم
# کورتەیەکی مێژووی و جوگرافیایی دەربارەی سێگۆشەی بەرمۆدا

## باسی یەکەم
## سێگۆشەی بەرمۆدا چیە ؟ بۆ هێندە بەنامۆ و سەرسوورهێن باسدەکرێ؟

:دورگەیەکە لەخۆرئاوای زەریــای ئەتڵەســی ، کۆلۆنیالییــەکی بەریتانییــە ، Bermodaبەرمۆدا

پایتەختەکــەی شــاری( هــەڵمتن )[1]ە ، ئــەو هــەموو بــاس و لەســەر نوسـین و لێکۆڵینەوانەی کە باس لە دیارنەمان و بزربوونی کەشـتی و پـا پۆڕ و فڕۆکـە دەکەن ، لەدورگەکەدا ڕوونادات ، بەڵکو لەو ڕووبــەرە ئاوییــەدا ڕوودەدات کـە شێوەی سێگۆشەیە پێکدێنێ ، نەك هەرئەوەنــدە ، بــەڵکو لــەناو ئەوڕووبــەرە ئاوییە سێگۆشەیەدا ، دەریایەك هەیە بەناوی دەریای سارجاسۆ ، یان دەریــای سەرگس کە بەبەراوردکردن لەگــەڵ سێگۆشــە گەورەکــەدا ڕووبــەرێکی بــچووك دەگرێتەوە و زۆرینەی ئــەو ڕووداو و کارەســاتانەی دیارنــەمان و لەناچــوون و بزربوونی کەشتی فڕۆکە لەناو ئاو و ئاسمانی ئەو دەریایەدا ڕوودەدەن .

ئەم ڕووبەرە شێوە سێگۆشــەیە لــە زەریــای ئەتڵەســدا ، ســەدان ســاڵە بۆتــە ناوچــەیەکی بــەناوبانگ و ســەرنج ڕاکــێش ، لــەو ڕووەوە کــە ناوچــەیەکی مەترسیدارە ، کەشتی و فڕوکەی تیا دیار نامێنێت ، ئەو پا پۆڕ و فڕۆکانە لــە بارودۆخێکی ئەوەندە ئاڵۆز و نادیار و نەزانراو دا نامێنن و لــەناو دەچــن کــە بۆتە مایەی سەرسووڕمان و ژمایەرەکی زۆر پرســیار ، نــەك هــەر لای خــەڵکی هەرەمەکی ، یان لای خوێنەران و ڕۆشنبیران ، بەڵکو لای زانایان و پــسپۆڕان و

تەنانەت دەزگا و لێپرسراوانی دەوڵەتیش . ئەم ڕووبەرە ناوییە شێوە سێگۆشەیە ، بەرپرسە لە دیارنەمان و تیا چوونی زیاتر لە سەد پاپۆڕ و فرۆکە و بۆتە مایەی لەناوچوون و دیارنەمانی زیاتر لە هەزار کەس [٢] ، لەبارودۆخێکی ئاڵۆز و نادیار و نامۆدا ، لەوانەش سەیرتر و نامۆترکەزۆرینەی ئەو پاپۆڕ و فرۆکانەی لەم سێگۆشەیەدا دیارنەماون هیچ پاشماوە و ئاسەوار و قوڵاخێکیان لە پاش بەجێ نەماوە ، مەگەر بە دەگمەن، هەتا ئێستاش تەرمی هیچ کام لەو قوربانیانە نەدۆزراونەتەوە .

کەواتە ڕاستیەك هەیە ئەویش ئەوەیە ، ژمارەیەك کەشتی و پاپۆڕ و فرۆکە لەم ناوچەیەدا دیارنامێن و بەدەگمەن ئاسەوارەکانیان دەردەکەونەوە ، ژمارەیەکی زۆر مرۆڤ دیار نامێنێ و بێسەر و شوێن دەبن ، هەرچەندێك هەوڵ و گەڕان و پشکنینیان بەدوادادابکرێت بێسوودە .

ئەو کارەسات و ڕووداوانە لە بارودۆخێکی ئاڵۆز و نادیاردا ڕوودەدەن ، نامۆیی و سەرسوورمانەکە لەوەدایە کە هەتا ئێستاش حکومەتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەڕەسمی ئەم ناوچەیە بە ناوچەیەکی مەترسیدار نەناساندووە و هاتوچۆی تێدا قەدەغە نەکردووە ، هۆیەکانی ڕاگەیاندن و چیرۆکەکانی خەیاڵی زانستی هێندەی تر بابەتەکەیان گەورەکردوون و خەڵکێکیان تۆقاندووە ، بگرە لەهەندێ حاڵەتدا بۆ مەبەستی دەستکەوتنی ئابووری ، بابەتی زۆر نازانستی و ئەفسوناویشیان تێکەڵکردوون،ئەمانە هەموویان ترس و دڵەڕاوکێیان خستۆتە ناو دڵی ئەك هەر ئەوانەی گەشت بەم ناوچەیەدا دەکەن ، بەڵکو دانیشتوانی ناوچەکانی تری سەر گۆی زەویش ، بەتایبەتی هەندێك وا بیردەکەنەوە ، کە نابێت لەسەر گۆی زەوی بە تەنها ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا هەبێت دیاردەی ئاوا سەیرو نامۆی تێدا ڕووبدات ،

لە ڕاستیشدا لە سەر گـۆی زەوی – لەسـەر ئـاو بێـت یـان لەسـەر وشـکانی – ناوچەی تـریش هەن کە لـەو جـۆرە دیاردانـەیان تێـدا ڕوودەدەن و زانـستیش بەرانبەریان دەستەوەستانە

پێویستە ئەوەش بگوترێت ئەم ناوچەیە ناوی زۆری تریشی بەسـەردا بـڕاوە ، پەیوەندی بەهێزیش هەیە لەنێوان ناوەکەوئەو ڕووداوانـەی لـەم ناوچـەیەدا ڕوودەدەن لەو ناوانە :

سێگۆشەی شەیتان ، دەریـای دیارنـەمان ، گۆڕسـتانی ئەتڵەسـی ، سێگۆشـەی تـرس ، سێگۆشەی تۆقـان ، سێگۆشەی مردن سێگۆشەی توندوتیژی و سێگۆشـەی ئەفرەتلێکراو ، هەموو ئەم ناوانە کەلەم سێگۆشەیەیان ناون ئەو بەشەی کـە بەدەریای سارجاسۆ ناودەبرێت بونەتە خەسلەت و نیشانە بۆ ئـەم ناوچـەیە ، هەموویـان نیشانەی ترس و گومان و دڵەڕاوکێ و بێدەسەلاتی مرۆڤن لە ئاسـت ئەو ڕووداوانەی لەم ناوچەیەدا ڕوودەدەن

## باسی دووەم
## شوێن و شێوەو ڕووبەری سێگۆشەی بەرمۆدا

سێگۆشەی بەرمۆدا دەکەوێتە خۆرئاوای زەریای ئەتلەسییەوە ، بەرەو کەنارەکانی خۆرهەلاتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ، لە باشووری فلۆریدادا ،تەنها ( ٩٣٠کم ) لە کەنارەکانی خۆرهەلاتی ئەو ولاتەوە دوورە ، ئەم سێگۆشەیە سنوورێکی دیاریکراوی نییە ، کە ڕوون و ئاشکراو زانراوبێت ، بەلام لە زۆرینەی نەخشەکاندا بە سێگۆشەیەك دیاری دەکرێت کە نووکی، یان سەری ئەو سێگۆشەیە لە دوورگەی بەرمۆدادایە ، لایەکەی خۆرئاوای لە بەرمۆداوە درێژ دەبێتەوە هەتا دەگاتە کەنارەکانی خۆرهەلاتی ئەمەریکا لە باشووری فلۆریدا ، بنکەی سێگۆشەکەش لە باشوری فلۆریداوە درێژ دەبێتەوە بەرەو( کوبا ) و پاشان بەرەو ( هایتی ) دواتر بۆ ( پۆرتۆریکۆ ) لایەکەی خۆرهەلاتی ، لە خۆرهەلاتی پۆرتۆریکۆوە درێژ دەبێتەوە هەتا دەگاتە بەرمۆدا لە باکور بڕوانە نەخشەی ژمارە ( ١ )

کەواتە ئەم ناوچە شێوە سێگۆشەیە کۆمەلێك دورگە لەخۆ دەگرێت کە ژمارەیان دەگاتە نزیکەی ( ٣٠٠ ) دورگە ، زۆرینەیان ئاوەداننین و دانیشتوانیان تێدا نییە ، لەو ژمارە زۆرە تەنها ( ٢٠ ) دورگە ئاوەدانن و دانیشتووانی تێدان ، کۆی ژمارەی هەموویان دەگاتە ( ٦٥ )هەزار کەس

بەلام خودی دورگەی بەرمۆدا خۆی کە کۆلۆنیالییەکی بەریتانییە، ژمارەی دانیشتوانەکەی نزیکەی ( ٨٠ ) هەزار کەسە ، بەزمانی ئینگلیزی دەدوێن و یەکەی پارەکەیان دۆلاری ئەمەریکاییە ، ئاینیان مەسیحی پرۆتستانتییە و سەر بە کەنیسەی ئینگلیزن )

شایانی باسە هەتا ئێستاش بەشێوەیەکی ووردو بابەتیانە ڕووننەبۆتەوە کە بۆچی ووشەی سێگۆشە لێکنراوە بەناوی بەرمۆداوە ، ئێستاش لە هەموو نەخشەکان و بلاوکراوەو تەنانەت لەئاخاوتنیشدا ناوچەکە بەسێگۆشەی بەرمۆدا دەنوسرێت و دەگوترێت ، گەر بگوترێت بەرمۆدا ڕەنگە والێکبدرێتەوە کە مەبەست تەنها دوورگەکەیە ، بەلام کە دەگوترێت سێگۆشەی بەرمۆدا ئەوسا مەبەست لە ناوچە مەترسیدارەکەیە ، سەبارەت بەناونانی ئەو ناوچەیە بە سێگۆشە دەتوانین دووجۆرە ڕاو بۆ چوون بهێنینەوە کە ئەمانەن

ا- هەندێك دەڵێن ئەو ڕووبەرە ئاوییەی کە بە کارەساتی دیار نەمان و لەناوچوون و بێسەروشوێن بەناوبانگە لە شێوەی ڕووبەرێکی سێگۆشەدایە ، گەرچی لەناو ئەم سێگۆشەیەدا پلەکانی مەترسی لە جێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی تر جیاوازن ، بەلام ئەو ناوە بەگشتی لەو ڕووبەرە نراوە کە زۆرینەی هەرە زۆری ڕووداوەکان لەوێدابووە هەرچەندە هەندێك هەن ڕایان وایە شێوەی ئەم ناوچەیە هەر لە بناغەدا سێگۆشە نییە ، بەڵکو هێلکەییە ، یان پارچە بازنەن و نووکەکەی کەوتۆتە بەرمۆداوە

ب-هەندێکی تر پێیان وایە ، ئەو ناوە لەدوای کارەساتەکەی ساڵی ( ١٩٤٥ ) وە بەسەر ئەو ناوچەیەدا بڕاوە ، چونکە لەو ڕووداوەدا ( ٥ ) فڕۆکە بەسەر ئاسمانی ناوچەکەوە بوون کە کتوپڕ دیارنەمانو لەناو چوون ، چەند چرکەیەك پێش لەناو چوونیان بەشێوەی سێگۆشە لە ئاسمانی ناوچەکەدا دەفڕین[٧] ڕەنگە ( ڤینیست جاریس ) یەکەم کەس بووبێت لە ساڵی ( ١٩٦٠ ) وە ئەم زاراوەی سێگۆشەی لەگەڵ بەرمۆدادا بەکارهێنابێت ، بەلام دوای ئەو و ئەو کەسانەی کە ئەو زاراوەیان بەکاردەهێنا مەبەستیان لەوە ڕووبەرێك بوو کە زۆر

گەورەتر و فراوانتر بوو لەوەی جاریس مەبەستی بوو ، کەواتە سێگۆشەی بەرمۆدا دەکەوێتە ناو دەریایەک لەزەریای ئەتلەسی کەبەدەریای سارجاسۆ دەناسرێت ، کە کۆی ڕووبەرەکەی ٧٧٠٠کم ٢ یە زۆرینەی هەرە زۆری ڕووداوەکان لەوێدا ڕوودەدەن .

# باسی سێیەم
# سێگۆشەی بەرمۆدا لەمێژوودا

ئەو باس و ئەفسانانەی کە باس لە بەرمۆدا و دیاردەسەیر و نامۆکانی ناوی دەکەن زۆر کۆنن ، هەندێکیان دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی فینیقیەکان و قرتاجییەکان ، ئەمانە هەزاران ساڵ پێش ئێستا پیایدا تێپەڕبوون و توشی کارەساتیش هاتوون ، بەلاّم هیچ نوسراوێکی مێژووی و دەقی کۆنی ئەو تۆ لەبەردەستدا نیە کە بە ووردی باس لە ژمارە و جۆری زیان و لەناوچوونەکان بکات لەم ڕووەوە ئەدمیراڵێکی قرتاجی کەناوی ( هەڵکمۆ ) بووە و ساڵی ( ٥٠٠ پ.ز ) دا سەبارەت بە دیاردەی سارجاسۆ دەڵێ ( ..... ڕێژەی هەواکەی ئەوەندە نییە پاپۆڕەکان بجوڵێنت .... قەوزەکان ئەوەندە زۆر و بڵاون کە لەهەموو لایەکەوە دەوری پاپۆڕەکە دەدە بەڕادەیەك
دەبنە کۆسپ لەبەردەم ڕێکردیندا زیندوەر و ئاژەڵە سەیر و نامۆکانی ناو ئاوەکە دەورو پشتی پاپۆڕەکە دەگرن )( ٨ )
ڕاووچیەکان لە کۆندا بەردەوام لەم ناوچەیە دورکەوتونەتەوە و بەناوچەیەکی شووم و ئەفرەتلێکراو مەترسیدارەیان داناوە ، کۆلۆمبس لە ساڵی ( ١٤٩٢ ) لە یاداشتەکانیدا نوسییویەتی (( ... لە ئاوی بەهامادا بەتاییەتی لە دەریای سارجاسۆدا ، دوای دووکاتژمێر لە خۆرئاوابوون دیاردەیەکی زۆر نامۆ و سەرنجڕاکێشمان دی ، شەوقێك یان ڕووناکیەك لەژێر ئاوەکەوە دەبینرا بەڕادەیك ئاوەکەی ڕووناکدەکردەوە ، گۆیەکی گەورەی ئاگرینمان بینی کەوتە ناو ئاوی زەریاکەوە ، دواتر لەبەرچاوومان نەما .... جووڵەی قیبلە نما لەم ناوچەیە سەرسووڕێهنەرەو مرۆڤ لێی تێناگات [٩]

لەمێژووی نوێ و هاوچەرخیشدا دیاردەی زۆر سەیر و سەرنج راشکێش لەم سێگۆشەیەشدا بینراون و ڕووشیانداوە لەوانە کەشیتەوانەکانی ئەو پۆلۆی دوانزە دەڵێن لەو شەوەدا ڕووناکییەکی زۆریان بینیوە لەسەر ئاوی ئەم ناوچەیە ،هەر لەو وەسفە دەچێت کە کۆلۆمبس کردوویەتی (١٠)

دیاردەی دیارنەمان و لەناچوون و بێسەروشوێنبوونی ژمارەیەکی زۆر کەشتی و پاپۆڕ و فڕۆکە لەم ناوچەیەدا و لەسەدەی ڕابردوودا گرنگی زۆری داوەتە ئەو ناوچەیە ، تا ئەو ڕادەیەی هەندێ کە دەڵێن سێگۆشەی بەرمۆدا گەورەترین هەڕەشەی سەدەی ڕابردوو و ڕەنگە داهاتوش بێت کە توشی مرۆڤ هاتووە .

# پەراوێزەكانی بەشی یەكەم

( ١ ) محمد محمد اسماعيل ، مثلث برمودا بين الحقيقة والخيال ، مجلة العلوم ، العدد ٧٥ ،ص ١٨.

( ٢ ) خالد حامد العرفي ، مثلث برمودا مقبرة الاطلنطي ، القاهرة ، ١٩٩٣ ، ص ٢٢

( ٣ ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٢

( ٤ ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢١

( ٥ ) لەئینتەرنێتەوە ، www.foreritrea.8m.com

( ٦ )يولا محسن ، الجغرافيات ، بيروت ،١٩٩٩ ، ص ٨٣

( ٧ ) د. أمين ابو الروس ، مثلث برمودا مثلث العرب والكوارث ، القاهرة ، ١٩٨٩ ص ١١

( ٨ ) د. طالب ناهي الخفاجي ، أسرار مثلث برمودا ، بغداد ، ( بدون سنة الطبع )

( ٩ ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل٩

( ١٠ ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل ٩

## حاڵەتەکانی دیارنەمانی کەشتی و پاپۆڕەکان

زۆرینەی دیاردەکانی دیارنەمان و بزربوون و بێسەر و شوێن بوونی کەشتی و پاپۆڕەکان لەناو ناوی ئەو ناوچە سێگۆشەئاسایەدا ڕوودەدات کەبەدەریای ساجاسۆ دەناسرێت ، ڕێژەیەکی کەم لەو ڕووداوانە دەکەونە دەرەوەی سنووری جوگرافیای ئەو دەریایە ، تا ئەورادەیەی هەندێك لەوانەی وێلْ و پەرۆشی هەواڵەکانی دیارنەمانی کەشتی و پاپۆڕن ، هەتالەگۆڤارو ڕۆژنامەوکەناڵەکانی تەلەفیزۆندا ڕیپۆرتاژو سیمنارو قسە وباسی لەسەربکەن ، ئەوان ناڵێن ڕووداوەکانی سێگۆشەی بەرمۆدا بەڵکو زاراوەیەکی تری وردتروریاریکراوتر بەکاردەهێنرێت ، ئەویش ( ڕووداوەکانی دەریای سارجاسۆ ) یە ، لەبەرگرنگی ئەم بەشەی سێگۆشەی بەرمۆداو لەبەرئەوەی زۆرینەی ڕووداوەکان لەم دەریایەدا ڕوودەدەن ، بەباشی دەزانین هەندێ زانیاریی زۆرترو لەباسێکی سەربەخۆدا خەسڵەت و نیشانەکانی ئەودەریایە بخەینەروو .

# باسی یەکەم
# دەریای سارجاسۆ

ئـەم رووبەرەئاوییـە لەهەنـدێ سەرچـاوەو ئەتڵەسـدا بـەدەریایی سـەرغس ناودەبرێت ، رووبەرێکی ئـاویی گەورەیـە – دەرياییـە – دەکەوێتـە بـاکوری خۆرئاوای زەریای ئەتڵەسییەوە ، ئەم دەریایـە هەنـدێ نیـشانەو خەسـڵەت و تایبەتمەندی هەیە جیاوازن لەرووبەرە ئاوییەکان دەوروبەری لـەناو هـەمان زەریـادا لەسـەرهەمان بازنـەی پـانی ، تەنانـەت جیاوازیـشە لەرووبـەرە ئاوییەکانی تری سەرگۆی زەوی . لەخوارەوە بەکورتی هەندێك لەو خەسـڵەت و تایبەتمەندییانە دەخەینەروو :

١ . برێکی زۆر قەوزەو رووەکی خۆهەڵواس لەناو ئاوی ئـەم دەریایـەدا هەیـە کەخەڵکی ناوچەکەش بەسەرغاس یان سەرغسی ناودەبەن ، رەنگـەناوی ئـەم دەریایە ش هەرلەم دیاردەیەوە هاتبێ ، ئەم برە زۆرە لەقەوزەو لەورووەکانەی تربە پارچەی بچووك و بڵاو دەبینرێت ، بەرادەیەك رووبەرێکی گـەورەی ئـاوی دەریاکە دا پۆشیوە ، جاری واهەیە کەدەبێتە کۆسپ لەبـەردەم کەشـتیرانیدا[١] بوونی ئەم برە زۆرە لەقەوزەو جۆرەکانی تری رووەکـە خۆهەڵواسـەکان لـەناو قوڵایی زەریایی ئەتڵەسیدا دیاردەیەکی تارادەیـەك ئـامۆو سەرنجراکێـشە ، تەنانەت ئەو کەشتی و پاپۆرانەی بەم ناوچـانەدا تێپـەردەبن گـەر زانیـاری پێـشتریان لەسـەر ئـەم دیاردەیـە نـەبێت وادەزانـن لەکەنارەکانـەوە نزیکبوونەتەوە .

٢- یەکێکی تر لەخەسڵەتەکانی تری ئـەم دەریایـە ئـارامی و کەمجووڵـەیی و هێمنی هەوای سەررووبەرەئاوییەکەیە هەروەها بەشـێوەیەکی گـشتی تـەوژم و شەپۆلی دەریایشی کەمە کەواتـە دەریایـەکی مـەنگ و ئـارام و خـامۆش هـەر

لەئارامگەو گۆرستان دەچێت ، بۆیە پێشبینەکان بەدەریایی مردوو ناویان بردووە .

٣- بنکی ئەم ئاوە ژمارەیەکی زۆر پاشماوەی کەشتی و پاپۆری تێکشاو وئێسك و پروسکی ئاژەڵان و تەنانەت مرۆڤیشی تێدادۆزراوەتەوە ، کەدەگەرێتەوە بۆسەردەمانێکی جیاواز هەرلەو کاتەوە کەگەشت بەکەشتی چارۆکەداردەستپێکردووە هەتا ئێستا ، رەنگەلەبەرئەمەشبێت هەندێك بەم ناوچەیە دەڵێن ( گۆرستانی ئەتلەسی ) جۆرو قەبارەو ژمارەی ئەوکەرەسە ژێر ئاو کەوتووانەی ئەم ناوچەیەلە هەموو بەشەکانی تری سێگۆشەی بەرمۆدا زۆرترن ، هەرلەبەرئەوەیە زۆرێك لەکەشتیوان و لەوکەسانە دەچنە ژێرئاوەکە چاوقایم و سەرکەشن ، بەتەماعی زێروزیو دەچنەژێر ئاوی ئەم دەریایە ، برێکی زۆر ئاڵتوون و زیو و کەرەسەری بەنرخیان لەبنی ئەم دەریایەدا دەرهێناوە کەبە ملیۆنەها دۆلار مەزەندە دەکرێ ، خاڵێکی تری سەرنجراکێش هەیە ، ئەویش ئەوەیە کەهەندێك کەشتی و پاپۆر لەدەرەوەی دەریای سارجاسۆ دیار نەماون ، بەلام پاشماوەو ئاسەوارەکانیان لەم دەریایەدا بینراونەتەوە ، وەکو کەشتی ( ماری سیلیستی ) کە لەساڵی ( ١٨٧٢ ) داتیمێکی بەریتانی دۆزییانەوە ، بوونی ئەو ژمارە زۆرە لە پاشماوە نیشانەی زۆری رووداوەکانە لەم ناوچەیەدا ، ئەمە جگە لەو بەشە زۆرەی کەهیچ پاشماوەو ئاسەوارێکیان لە پاش بەجێنەماوە .

٤- یەکێکی تر لە خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی ئاوی ئەم دەریایە ئەوەیە کە ئاژەڵ و زیندەوەری ئاویی شێوە سەیرونامۆو زەبەلاحی تێدایە کەلای مرۆڤی ئەم سەردەمە سەیرو سەرنج راکێشە ، هەندێکیان لەوە دەچێ کەلەناو چووبن و نەمابن ، وەك دەیناسۆرەکان ، جگە لەم زیندەوەرانە ئێسکە پەیکەری ئاژەڵی زۆر زەبەلاح لەبنکی دەریاکەدا دۆزراونەتەوە ، درێژیی یەکێك لەو

ئێسكە پەیكەرانە بە ٣٠ م مەزەندەكراوە . لەساڵی ( ١٩١٧ ) دا لەنزیك ویلایەتی ماستشۆستیس ی ئەمەریكایی جۆرە مارێكی زۆر زەبەلاح بینراوە كەمێژووی ژیانی دەگەڕێتەوە بۆهەزاران ساڵ پ ز ، خەڵكی ناوچەكە كە پێیان وایە ئەو مارە زەبەلاحە لەناوی دەریایی سارجاسۆوە هاتبێتە ئەو كەنارانە

٥- دیاردەیەكی تری سروشتی سەرنجڕاكێشی تر كەلەبنكی ناوی دەریای سارجاسۆدا هەیە ، ئەویش بوونی ژمارەیەكی زۆری زنجیرە چیایە كە لووتكەكانیان تەختن لەوە دەچێت ئەو لوتكانە لە كاتی خۆیدا دورگە بووبن ، ئاوەدان و خەڵكی تێدا نیشتەجێبووبن ، دواتر بەهەر هۆكارێبووە ژێرئاو كەوتوون ، هەرلەبەرئەمەشە هەندێك دەڵێن لەشوێنی ئەم دەریایەدا ئاوەدانی و شارستانییەتێك هەبووە ، دواتر ژێر ئاو كەوتووە و لەناوچووە ، هەندێك لەزانایان مەنگی كە مجووڵەیی ئاوی ئەم دەریایە بەبوونی ئەم زنجیرە چیایە لێكدەدنەوە .

٦- كۆچی مارماسیەكانی جۆری ( ئەنكلیس ) لەڕووبارە ئاوشینە تەنگەكانی ئەوروپا و ئەمریكاوە بەرەو ئاوە سوێرو قووڵەكانی زەریای ئەتڵەسی و دواتر بۆ دەریای سارجاسۆ بۆتە بابەتێكی سەرنجڕاكێش و دواتر مشتومڕ لەناو زانایاندا ، بەتایبەتی لەناو بایالۆجییەكاندا ئەم جۆرە مارماسییە ئەو گەشتە گرتن و ئەوماوە دوورە دەبڕن ، هەر لەڕێگادا ژمارەیەكی زۆریان لێ لە ناو دەچێت هەتا دەگەنە دەریای سارجاسۆ ، لەوێش پاش گەرادانان دەمرن ، كە گەراكان ترووكان و كەمێك گەورەبوون ، ئەوانیش دیسان ئەو گەشتە گرانە دەگرنەوە بەر و دێنەوە بۆ ئاوە شیرینەكانی ئەوروپا و ئەمریكا [٦]

لەبارەی كۆچی ئەنكلیسەوە لێكدانەوە و بیرۆز جۆراوجۆر كراوە دانراوە ، لەوانە بیردۆزێكی بەناوبانگ هەیە دەڵێت ...

**نیشتمانی ئەسڵی ئەوجۆرە مارماسیانە ، ڕووبەرێکی گەورەی ئاوە شیرینبووە کە بەڕووبەرێکی ووشکانی گەورەدا تێپەڕیوە ، ئەو ڕووبەرە ووشکانییە لە زەریای ئەتڵەسەیدابووە ، لە نزیک دەریایسارجاسۆ ئێستادا ، پاشان ئەو ووشکانیە ، یان ئەو دورگەگەورەیە ژێر ئاوکەوتووە ، بۆیە ئێستاش پاش تێپەڕبوونی هەزاران ساڵ ئەو جۆرە مارماسیانە دەگەڕێنەوە بۆ نیشتمانەکەی ٠خۆیان بۆ گەرادانان !! یان دەبێت ئەو هێزە چیبێت کەوادەکات ئەو زیندەوەرانە کێش بکات بەرەو ئاوی ئەو دەریایە !!**

# باسی دووەم
# خەسڵەت و نیشانەکانی دیارنەمانی کەشتی و پاپۆڕ لەم ناوچەیەدا .

زۆرینەی ئەو ڕووداوانەی کە لەناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا و بەتایبەتی لە دەریای سارجۆدا ڕوودەدەن ، تا ئەو ڕادەییەی وەك چیرۆکی خەیاڵی زانستی و مەتەڵ و ئەفسانەی لێهاتووە و لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنیان زۆر گرانە، پێور و پێوانە زانسیتەکان زۆر جار لە ئاستیانا دەستەوەستان دەوەستن ، زۆرینەی ئەو کەشتی و پاپۆڕانەی کە دیارنەماون و هەتائێستاش هەروا بەنادیاری ماونەتەوە، هەندێکی تریان دوای ماوەیەکی کەم یان زۆر دەرکەوتونەتەوە و سەریان هەڵداوەتەوە ، بەلاَم گۆڕانیان بەسەردا هاتووە ، یان دیاردەی نامۆو سەرنج ڕکێش ، یان ڕووداو و گۆڕانی بەسەرداهاتووە ،کەوەك مەتەڵیان لێهاتووە ، بۆ نموونە لەو دیاردەسەیرانە ، پاپۆڕە بزربووەکان دەرکەوتۆتەوە ، بەلاَم سەرنشینەکانی تیا نەبوون ،یان پاپۆڕەکە دەرکەوتۆوەتەوە بێسەرنیشتنەکانی ، بەلاَم هەموو کەرەسەو کەلوپەلەکانی ناو پاپۆڕەکە وەك کەلوپەلی شەخسی ، پارە ئاڵتوون ، کەرەسەی تری گرانبەها ، بەلەم و چاکەتەکانی خۆرزگارکردن ، خواردن و خواردنەوە ، هەر لەوشێنی خۆیان ماون بێئەوەی هیچ گۆڕانێکیان بەسەردا هاتبێت یان دەستکاری کرابن ، یان لەهەندێ بارودۆخی تردا دیارنەماون و بزربوونەکە لە شوێنێکدا ڕوویداوە ، بەلاَم کەشتیەکە ، یان پاپۆڕەکە لەشوێنێکی تر دەرکەوتۆتەوە کە زۆر دووربووە لە شوێنی ڕووداوەکە ، بەواتایەکی تر پاپۆڕەکە لە هێڵە دیاریکراوەکەی خۆی لایداوە ، لەوەش سەرسوڕهێنەرتر ، لە هەندێ حاڵەتی کەمدا سەرنشینەکانی پاپۆڕەکە دیارنەماون ، بەلاَم ئەو ئاژەل و باڵندانەی کە لەناو پاپۆڕەکەدا بوون هەر بەزیندووی ماون .

لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکرێت ، کە هەموو ئەو حاڵەتانەی دیارنەمان و بزربوونە کە بەدرێـژای مێـژوو بەسـەر کەشـتی و پـا پۆڕەو فڕۆکەکانیـشدا هاتبێـت چـەند لایـەنێکی سـەرنجڕاکێش و جێگـە پرسـیار و تێرامـان و سەرسوڕمانی تێدا هەبوو لەوانە :

١. زۆرینەی کەشتیوان و فڕۆکەوانەکان کەسانێکی شارەزا و لێهاتوون ، خـاوەن ئەزموون و پسپۆڕ بوون لەو بوارانەدا ، تەنانەت هەندێك لـەو پا پۆڕانـە زۆر توند و تۆڵ و قـایم و مەحکـەم دروسـت کرابـوون – یـەکێکیان بـە تەبـەدۆر دەورەدرابوو کە نابێت ژێر ئاو بکەوێت- جگە لەمانە شوێنی دەریای سارجاسـۆ لە قوڵای زەریای ئەتڵسەیدا کەسانێکی نەشـارەزایان ئارەزومەنـدانی فـڕین و کەشتیرانی بەدەگمەن ڕێگەیان دەکەوێتە ئەو شـوێنە ، ئـەی بـۆ دەبێـت ئـەو هەموو ڕووداوە و کارەساتـانە لەم کەسە شارەزاو لێهاتووانـە ، لـەو پـا پۆڕە و توند و تۆڵ و مەحکەم دروستکروازانە بقەومێ ؟!

٢. زۆرینـەی دیـاردەی دیارنـەمان و بزربوونـەکان لەکـەش و ئاووهەوایـەکی وادابوون کە لەبار و گونجاو بوون بۆ کەشتیرانیی دەریـایی و ئاسمـانی ، لـەو کاتـانەدا کە ئەو پا پۆڕ و فڕۆکانە دەستیان بەگەشتەکانیان کـردووە ، نـەبای بەهێز ، نەزریان و تۆفانی توند نەتەوژمە دەریـا ، نەهەڵـچوون و داچـوونی گەورە ، تەنانەت بۆمەلەرزەش لەناوچەکەدا ڕوویاننەداوە ، بەڵگەش بۆ ئەمە هەتا ماوەیەکی زۆر کەم پێش ڕوودانی ڕووداوەکان بارودۆخی سروشتی ناوچکە زۆر ئارام بوو ، ئەو پەیوەندی و ڕاگەیاندن و گفتوگۆیانەی کەلەنێوان پا پۆڕ و بنکە و شوێنە تـایبەتیەکانەوە تۆمـار کـران ، بـەڕوونی ئـەوە نیـشان دەدەن کەهـەتا ماوەیـەکی زۆر کـەمیش پـێش ڕووداوەکـە بارودۆخـە سروشـتیەکان لەباربوون ، پێش وەخـت هیـچکام لـەو پـا پۆڕ و فڕۆکانـە بنکـەو و شـوێنە

تایبەتیەکانی دیاری کراوی زانراو چاوەڕوانیان دەکات ، جگە لەو پەیوەندیە لەناکاو ئالۆز و پچڕپچڕانەی کە لەکاتی ڕوودانی ڕووداوەکاندا کراون بۆ بنکەکانی خۆیان ، کەئەوانەش هەر هەموویان کورت بوون ، ئالۆزبوون، بنکەکانیان بەگران لێیان حاڵیدەبوون هەمووشیان نیشانەی ترسێکی زۆر و شپرزەییبوون ، تەنانەت تۆقاندنیان پێوە دیاربوو ، هەرهەمووشیان یارمەتی فریاگوزاری بوون .

٣. ئەو ماوەیەی کە دیارنەمان و بزربوون و بێ سەروشوێنبوونەکە تێدا ڕوویدا، ماوەیەکی زۆر کورت بووە ، هیچ دەرفەتێك و بوارێك لەبەردەم سەرنشیەکاندا نەبووە . هەتا بە ئارامی و بەژیری بیربکەنەوە ، ئەوساکار و بڕیاری گونجاو بدەن ،بەبەڵگە ئەوەی ئەو پەیوەندییە بێسیمانەی کە لەنێوان پاپۆڕ و فڕۆکە و بنکەکانیاندا هەبوون و تۆمارکراون ، ماوەیەکی زۆر کەمیان خایاندووە ، دواتربڕاوە و نەماوە و کارەساتەکە ڕوویداوە .

٤. لە هیچکام لەو ڕووداوانەی کە لەناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا ڕوویانداوە ئەوشەڕ و کۆشتارو خوێنرێژان و چەك و کەرەسەی جەنگی ، تەرم و لاشەی کوژراو و بریندار کەرەسەکانی شەڕکردن و جەنگ نەدۆزراونەتەوە و نەبوون ، مرۆڤی نامۆ ، یان زیندەوەری نامۆ و شێوەی سەیر لەسەرو لەناوی کەشتی و پاپۆڕەکاندا نەدۆزراوەتەوە ، وەك ئەوە وابوو ئەو ڕووداوە – یان گەر دەستەواژەکە دروستبێت بڵێن ئەو شەڕە – لەنێوان دوو هێز ، یان دوولایەنی نابەرامبەر و ناهاوسەنگدابووە ، لەوە دەچێت لەلایەن سەرنیشینانی ئەو پاپۆڕ و فڕۆکانەوە هیچ بەرگریەکی وەها نەبوویێت و نەکرابێت .

٥. لەسەرنجدا لە ئاسەوار و پاشماوەکانی ئەو کەشتی و پاپۆڕانەی دوای ڕووداوەکان دەرکەوتوونەوتەوە ، دەردەکەوێت کە ئەو پرۆسەیە بە ئارەزوو ،

یـان بـە ڕمزامەنـدی سەرنـشینەکان نـەبووە ، بـەڵکو بـەزۆرەملێ و تـۆپزی ئەنجامدراوە ، بەڵگەش بۆ ئەمە ، کەئەو ڕووداوانە ڕوویانداوە سەرنشینەکان ، کەلو پەل و پارە وزێڕ و شتی شەخسی و لەهەندێ حاڵەتـدا ژەمـە خـۆراکی تەواو نەکراویش هەروەك خۆیان ماونەتەوە ، هەموو ئەو شتانە باسیان لێـوە کراوە سەڵمێنراوە خۆیان لە جێگەی خۆیاندا ماون .

٦. لەهەندێ لە حاڵەتەکانی دیارنەماندا لەگـەڵ دیارنـەمانی مرۆڤەکانـدا سەر کەشتی و پاپۆڕەکان ، زیندەوەرانی تری سەر ئەو کەشیتیانە وەکو باڵندە و شەك و پشیلە دیار نەماون ،هەتا ئێرە دیاردەکە ئاساییە ! بەلاّم لە هەندێ حاڵەتـدا تـەنها مرۆڤـی نـاو کەشـتی و پاپۆڕەکـان دیارنـەمان ، ئـاژەڵ و باڵندەکان بەزیندووی ماونەتەوە ، کە ئەمە نائاسـاییە ، جێگـەی پرسـیار و تێرامانە !!

وەکو دوو پشیلە زیندوەکەی سەرکەشتی ( کارۆل دیرینج ) ساڵی ( ١٩٢١ ) وەسـەگە زیندووەکەی سەرکەشتی ( رۆبیکۆن )

٧. ئەو پاپۆڕ و کەشتی و فڕۆکانـە کـە دیـار نـەماون ، یـان لـە ناوچـوون ، سەربەولاّتـانی جیاوازن و کیشوەری جیاوازبوون، وەك ئەمریکایی ، بەریتانی ، ئوسترالی ، ژاپۆنی ، ... هتد ، گەرچی بەگوێرەی نزیکیی شوێنەکە لـە ولاّتـە یەکگرتوەکانی ئەمریکاو ، زۆرینـەی پـاپۆڕ و فڕۆکـەکان ئـەمریکایی بـوون ڕودانی ئەودیاردانە لە دەریای سارجاسۆ و سێگۆشەی بەرمۆدادا ، هەمیشە یی و بەبەردەوامی نییە، ناو بەناو ئەماوەی جیاوازدا ڕوودەدەن ، هەر لە سـەرەتای دەستپێکردنی کەشتوانیەوە و تـا ئێـستا لـەم ڕووداوە دوو تێبینـی هـەن کـە ئەمانەن :

أ- لەم سـالاّنەی دووایـیدا ، بەتایبـەتی لـە سـاڵەکانی یەکـەمی هـەزارەی سێیەمدا ، پێدەچێت ڕوداوەکان کەمتر بووبنەوە ، ئەمە خـاڵێکی زۆر گرنگـە ،

ڕەنگە لەبەر چەند هۆکارێکبێت لەوانە ، کۆمپانیا و دەوڵەتان و تاکەکانی خەڵکی ، لەبارەی ئەو ناوچەیەوە زانیاری زۆرتریان هەیە و دەبێت ، بەمەش خەڵکی خۆیان لێبپارێزن ، یان دەشێ هەر لە بناغەدا و لەبەر هەر هۆکارێکێك بێت ، ئەو دیاردانە کەمبوونەوە .

ب- هەندێك لێکۆڵینەوە لەم ساڵانەی دواییدا بڵاوبوونەتەوە کە بە گشتی باس لەوە دەکەن کە زۆرینەی ڕوودانی ئەو دیاردانە زۆرینەی لەوەرز و کاتی دیارکراودایە ، ئەویش لە کاتەکانی جەژنەکانی لە دایکبوون و سەری ساڵدایە ، ڕەنگە ئەمەش لەبەر ئەوەبێت ، کە لەو ڕۆژانەدا جووڵە و ژمارەی گەشتەکان زۆر تر دەبن [٦]

٩. کەشتی و پاپۆڕ و فڕۆکە دیارنەماوەکان سەربازی و شارستانین ، هەربەتەنها سەربازی نین ، وەك هەندێك باسیان لێوەدەکەن ،

١٠. هیچ پەیوەندیەك نییە لەنێوان بار ، یان ڕەگەزی ئەو سەرنشینانەی کە لەناو کەشتی و پاپۆڕەکاندا بوون ، ئەو بارانەی هەڵیان گرتبوو و هەمە جۆر بوون ، وەکو گەنم ، خەڵووزی بەرد ، ڕۆنی ڕووەکی، مەی ، مەنگەنیز .

# باسی سێیەم

## کورتەیەک لەسەر دیارنەمانی ژمارەیەک کەشتی و پاپۆڕ

ژمارەیەکی زۆر یەخت و کەشتی و پاپۆڕی هەیە قەبارە لەناوی سێگۆشەی بەرمۆدادا دیارنەماون ، بزر و بێسەرو شوێنبوون ، گەرچی دوای ماوەیەک هەندێکیان هەربەساغی دەرکەوتوونەتەوە ، هەندێ جاریش ئاسەوار و قولاغی کەمێکیان دۆزراوەتەوە ، والە خوارەوە ناو و جۆر و بەرواری هەندێکیان لەوانە دەخەینە ڕوو :

١- لە ئابی ( ١٨٠٠ ) دا پاپۆڕێکی ئەمریکایی بەناوی ( ئەنسەرجت ) دیارنەما کە ٣٤٠ سەرنشینی تیا بوو

٢- لە ( ١٨٠٠/٨/٢٠ ) دا پاپۆڕێکی ئەمریکای کە ناوی ( بیکرینج ) بوو لە گەشتێکدا بوو بەرەو هیندستان ، بەخۆی و سەرنشینەکانیەوە کە ژمارەیان ٩٠ کەس بوو دیارنەما .

٣- ( ١٨١٤/١٠/٩ ) دیارنەمانی پاپۆڕێکی ئەمریکایی بەناوی ( واسب ) بەخۆیی و سەرنیشنەیەکانیەوە کە ژمارەیان ( ١٤٠ ) کەسبوو

٤- ( ١٨٢٤/١٠/٢٨ ) دیارنەمانی پاپۆڕێکی ئەمریکایی بەناوی ( وایلدکات ) کە لەگەشتێکدا بون لەکووباوە بۆ دورگەی ( ثۆمبسن ) بە سەرنشینەکانیەوەکە ژمارەیان ( ١٤ ) کەسبوو .

٥- لە ساڵی ( ١٨٥٠ ) دا پاپۆڕی( سی بێرد ) تووشی ڕووداوێکی سەیر هات لە ئەنجامدا هەمو سەرنشینەکانی دیارنەمان ، بەلاّم کەل و پەل و کەرەسە و خۆراکی ناو پاپۆڕکە هیچ دەستکاری نەکرابوو ، هەروەک خۆیان لە جێگای خۆیان مابوونەوە .

٦- کانوونی دووەمی (١٨٨٠) دیارنەمانی پاپۆڕێکی ئینگلیزی بەناوی (ئەتلەنتا) کەلە گەشتییکدا بوولەبەرمۆداوە بەرە ئینگلترا ، بەخۆی و (٢٠٠) سەرنشینەوە، دیارنەمانی ئەم پاپۆڕە و بەو ژمارە زۆرەوە پاڵی بە حکومەتی بریتانیاوە نا کە هەڵمەتێکی گەڕان و پشکنینی چڕ و پڕ دەستپێبکات ، بەلاّم بێ سوود بوو .

٧-(٤ی ئازار ١٩١٨) دیارنەمانی پاپۆڕێکی گەورەی بارهەڵگری ئەمریکایی بەناوی (سایکلۆب) کە لە گەشتێکدا بوو لەبەرمۆداوە بەرەو ڤێرجینیا ، یەکێك بوولە کەشتیەهەرە گەورەکانی گەشتیگەلی ئەوساکەی ئەمریکا ، درێژییەکەی (٥٠٠) پێ بوو (١٩,٠٠٠) تەن مەنگنیزی بارکردبوو ،ژمارەی سەرنشینەکانی (٣٠٩) کەسبوون ، ئەمە یەکێکە لە کارەساتە گەورەکانی سێگۆشەی بەرمۆدا ، بەڕادەیەك دوای ئەو ڕووداوە ڕێگای کەشتی برانیی ئەمیرکا گۆڕا .

٨- لە ساڵی (١٩٢٤) دا پاپۆڕێکی بارهەڵگری یابانی بەناوی (رای فۆکەر) دیارنەما ، ئەوەش تۆمارکراوە کە ئەم پاپۆڕە لەنێوان بەهاما و کووبادا داوای یارمەتی فریاکەوتنی کردووە (... ترس و تۆقان و هەڕەشەمان لێدەکات ، مەترسی ..... مەترسی .... دەستبەجێ بمانگەنی ) بەلاّم ماوە نەبوو کاری فریا کەوتن بێسوود بوو .

٩- لە (١٩٢٥) دا پاپۆڕێك بەناوی (کۆتۆپاکسSS )
دیارنەما کە لە گەشتەکەیدا بوو لەشارلستۆنەوەبەرەو هاڤانا .

١٠- تشرینی دووەمی (١٩٢٨) دیارنەمانی پاپۆڕێکی ئینگلیزی بەناوی (ڤستریس) کەلە گەشتێکدا بوو بەرەو باربارۆس)

**١١- لە ساڵی ( ١٩٣١ ) دا دیارنەمانی پاپۆڕێکی بارهەڵگر بەناوی ( ستاڤجەر ) لە نزیك بەهاما بەخۆی و هەموو سەرنشینەیەکانیەوە کە ژمارەیان ( ٣٩ ) کەسبوو**

**١٢- ئازاری ( ١٩٣٨ ) دیارنەمانی پاپۆڕێکی بارهەڵگر بەناوی ( ئەنگلۆئۆسترالین ) بەخۆی و سەرنشینیەکانیەوە کە ژمارەیان ( ٣٩ ) کەسبوو**

**١٣- کانوونی یەکەمی ( ١٩٤١ ) دیارنەمانی دووپاپۆڕی گەورەی ئەمریکا ، هاوشیوەی سایکلۆپ ، یەکەمیان بەناوی ( پۆرتیوس ) و دووەمیان بەناوی ( نریۆس ) کەهەریەکەیان بەجیا لە گەشتدا بوون لە دوورگەکانی ڤیرجینیاوە بەرەو ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا .**

**١٤-( ١٩٤٥ ) دیارنەمانی پاپۆڕێکی بارهەڵگری ئینگلیزی بەناوی سایکلۆپ.**

**١٥- تشرینی یەکەمی ( ١٩٥١ ) دیارنەمانی پاپۆڕێکی جەنگیی بەڕازیلی بەناوی ( ساوپاوڵۆ ) بەخۆی و هەموو سەرنشینەکانیەوە، هەموو ئەو گەڕان و پشکنیانەی ئێدراوە تایبەتییەکەی حکومەتی بەڕازیل ئەنجامیدان سەیریان نوسیوە لەوانە( ... ڕووناکیەکی نامۆمان بینی لەسەر ئاوی دەریاکە ... هەر لە ئێوارەوە هەتا بەیانی بەردەوام بوو ، بەڵام بۆ ڕۆژی دواتر تاریکایی و لێڵی سەر ئاوی دەریاکەی گرتەوە ، دوای ماوەیەکی تر باروودۆخەکە ئاساییبووەوە )**

**١٦- حوزەیرانی ( ١٩٥٥ ) پاپۆڕێکی بارهەڵگری گەورەی ئەمریکایی بەناوی ( ساتددرا ٥٥ ) دیانەما درێژیەکەی ١٠٠ پێبوو لە گەشتەکەیدا بوو بەرەو ڤەنزویلا**

**١٧- ( ١٩٦٣/٢/٢ ) دیارنەمانی پاپۆڕێکی بارهەڵگری ئەمریکایی بەناوی ( مارین شیلڤەر کوین ) پاپۆڕێکی گەورەبوو درێژییەکەی ( ١٣٠ ) م بوو ( ١٥,٠٠٠ ) تەن گۆگردی بارکردبوو ، ژمارەی سەرنشینەکانی ( ٣٨ ) کەس بوون .**

**١٨- ( ١٩٦٣/٧/١ )دیارنەمانی کەشتیەکی ئەمریکای بەناوی ( سنۆبۆی )**

١٩- لە ساڵی ( ١٩٦٥ ) دا لەماوەی هەمو ساڵەکەدا ( ٢١ ) کەشتی کەنارەکانی خۆرهەلاتی ئەمریکا دیارنەماون ، ئەمە پاسەوانانی کەنارەکانی ئەمریکا خۆیان ڕایانگەیاندووە و بلاویان کردۆتەوە ، هیچ پاشماوەیکیشیان نەدۆزراوەتەوە .

٢٠- ( ١٩٦٧ ) دیارنەمانی یەختێك بەناوی ( وتشکرافیت ) لە کەنارەکانی میامی .

٢١-( ١٩٦٧ ) دیارنەمانی یەخێتك بە ناوی ( ریڤۆنۆك )

٢٢- تشرینی دووەمی ( ١٩٦٨ ) دیارنەمانی پاپۆڕێکی گەورەی بارهەڵگر بەناوی ( ئەتەکا ئایلاند ) کەگەنمی بارکردبوو ، لەگەشتێکدا بەرەو مانشستەر .

٢٣- نیسانی( ١٩٧٠ ) دیارنەمانی پاپۆڕێکی گەورەی بارهەڵگر ( میلتن ئەترایدز ) ڕۆنی ڕووەکی بارکردبوو ، بەرەو کیپ تاون ڕێیدەکرد

٢٤-ئازاری ( ١٩٧٣ ) دیارنەمانی پاپۆڕێکی گەورەی بارهەڵگری ئەڵمانی بەناوی ( ئەنیتاواڵتی ) لەگەشتێکدا بوو لە ڤێرجینیاوە بەرەو ئەڵمانیا .

٢٥- ئازاری ( ١٩٧٥ ) دیارنەمانی پاپۆڕێکی گەورە بەناوی ( سلڤانۆسا ) بەخۆی و دەستە کەشتیوانەکەیەوە کە ژمارەیان ( ٣٧ ) کەس بوو .

٢٦- ئازاری ( ١٩٨٢ ) دیارنەمانی نەوت گوێزەرەیوەیەکی ئەمریکای لە ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا کەلە گەشتێدا بوو بەرەو پۆرسەعیدی میسر [٧]

باسی چوارەم /

هەندێك دیاردەی سەرسوڕێهنی دیارنەمانی کەشتی و پاپۆڕ :

لەو دیاردە سەیر و سەرسوڕێهن و نامۆیانەی کەلە دیاردەی دیارنەمانی کەشتی و پاپۆڕ لەناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا ڕوویان داوە کەمێك بەدرێژی باسی دوو نموونەیان دەکەین ئەوانیش ئەمانەن :

أ. لە ساڵی (١٨٨١)دا ڕووداویك بەسەر کەشتیەکی چارۆکەداری ئەمریکیدا هاتووە ، ئەوەندە سەیر و سەمەرەیە هێندەی ئەماوە بچێتە خانەی خەیاڵ و چیرۆکی زانستیەوە ، ئەم کەشتیە لە گەشتێکدا بوو لە خۆرئاوای زەریای (ئازر) ەوە ، بەرێکەوت کاپتنی کەشتیەکە چاوی کەوتووە بە کەشتیەك ، کەلەوە دەچووسەرنشینی تێدا نەبێت و بەجێهڵرابێت ، کە لێی نزویك بووتەوە بینویەتی کەسی تێدا نیە ، کەشتیە بەجێهڵراوەکە لە بارودۆخێکی باشدا بووە ، چارۆکە و گوریسەکانی هەموو باش و لەباربوون ، هیچ کەم و کوڕی و تێکشکاوی پێوە دیار نەبووە ، کاپتنەکە بەمە دڵخۆش بووە و بەدەستکەوتێکی چەوری و قەڵەوی زانیوە ، فەرمانی داوە بە ژمارەیەك لە پیاوەکانی کە داببەزنە ناوی دەیاریەکەوە وئەو کەشتیە بەجێهڵراوە ببەستنەوە بە کەشتیەکی خۆیانەوە هەتا کێشیبکەن بۆ کەنار زەریا ، ژمارەیەك لە پیاوەکانی دابەزیون و بەبەلەمە بچووکەکانیان خۆیان گەیاندۆتە کەشتییە بەجێهێلراوەکە ، لەو کاتەدا کە خەریکی پێکەوە بەستن و پێکەوە گرێدانی کەشتیەکە بوون ، گەردەلولێکی توند هەڵیکردووە ، پاشان زریان و باو تۆفانی زۆر بەهێز دەستیان پێکردووە کە بونەتە هۆی لێکجیابوونەوەی هەردوو کەشتیەکە ، کەشتییە بەجێهڵراوەکە بەسەر نشینەکانیاوە لە چاو بزربووە و دیارنەماوە پاش دوو ڕۆژ جارێکی تر کەشتییەبەجێهڵراوەکە دەرئەکەوێتەوە ، بەلام بەبێ سەرنشینەکانی کە پێیان وایە کەشتیەکەی خۆیان دەبێت ، کاپتنی کەشتییەکە ئەمجارەش پێ دادەگرێ لەسەر هێنانەوەی ئەو کەشتیە ، دیسان فەرمان دەدات کە دابەزن ، ئەوانیش دادەبەزن و دەگەنە لای کەشتی بەجێهێلراوەکە ، جارێکی تر بەهەمان شێوەی پێشوو گەردەلوول و زریان هەڵیکرد و ئەمجارەش کەشتیەکە و ئەوانەشی چووبوون بۆ هێنانەوەی دیارنەون و بێسەروشوێن بوون [٨]

ب- لە جەژنەکانی سەری ساڵی ( ١٩٦٧ ) دا یەختێکی پێشبڕکێ دیارنەماوە ، ئەم یەختە ( ١٤ ) م درێژ بووە ، لە زۆرێك لە پێشبڕکێکاندا پلەی زۆر باشی بەدەست هێناوە ، یەختێکی ناسرا و بەناوبانگ بوو ، خاوەنەکەشی کەشتیوانێکی بەتوانا و لێهاتوو بووە ، کەس لەو باوەڕەدا نەبوو کەلەڕووداوێکی بچوك و ئاساندا ئەو یەختە توند و تۆڵە و ئەو کەشتیوانە شارەزایە لەناو چن ، ئەوەندە زۆریش لەکەنارەکانەوە دورکەتبووەوە ، گەر لەنزیك کەنارەکانەوە توشی ڕووداو هاتبێت خۆ دەبێت پاشما وە و ئاسەواری لە پاش بەجێبمایە ، بەلآم تەنها و بەهەڵکردنی توندەبایەك ئەو یەختە و کەشتوانەکەشی دیارنەمان و هەتا ئێستاش بێسەروشوێنن [٩]

# باسی پێنجەم

## دەرکەوتنەوە و سەرهەڵدانەوە ژمارەیەك کەشتی و پاپۆڕ

پێشتر ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە ژمارەیەکی زۆر کەشتی و پاپۆڕ لە ناوی سێگۆشەی بەرمۆدادا دیارنەماون ، هەندێکیان هەتا ئێستاش هەر بزر و بێسەروشوێنن ، بەلآم هەندێکیان دەرکەوتونەتەوە ، و سەریانهەڵداوەتەوە ، ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە ژمارەیەکی زۆر لەو پاپۆڕانەی دەرکەوتونەتەوە سەلامەت و رێك و پێك بێکەموکوڕی و لەکار نەکەوتوون ، هەروەها زیندەومر و کەرەسەیَ ئامۆ و سەیر لەناو ئەو کەشتی و پاپۆڕانەدا بەدیکراون ، لەهەندێ بارودۆخدا لەناو کەشتی و ئەو پاپۆڕانەدا کەرەسەی گران بەها و پارە و ئاڵتوون هەبوون و دوای ڕووداوەکەش هەروەك خۆیان بێ هیچ دەستکاریەك ماونەتەوە و والەخوارەوەی ناوی هەندێ لەو کەشتی و پاپۆڕانە دەخەینە ڕوو کە ماوەیك دیارنەماون و دواتر دەرکەوتوونەتەوە :

١. لە ( ١٨٤٠ ) دا پاپۆڕێکی بارهەڵگری فەرەنسای کەناوی ( رۆزالی ) بوو دەرکەوتەوە و لەسەر ئاوی زەریاوە بینرایەوە ، پاپۆڕەکە لەبارودۆخێکی باشدا بوو ، چارۆکەکانی بەساغی مابوونو کراوەبوون ، ئەو بارەی هەڵیگرتبوو هەروەکو خۆی مابوو ، ئەوەی دیارنەمابوو تەنها سەرنشینەکان بوون ، تەنانەت باڵندەیەی ( کەناری ) کە پێشتر لەناو پاپۆڕەکەدا بوو هەربەزیندووی مابوومەوە [١٠]

٢. لە ( ١٨٧٢/٩/٥ ) دا ، کەشتیی ( ماری سینیستا ) لە نزیك ئاوی دەریای ساجاسۆ وە دۆزرایەوە ، چارۆکەکانی کراوە و لەکاردابوون ، بارەکەشی هەر لەسەر مابوو ، کە بریتبوو لە بەرمیلی دارینی پەرمەی ، ئاو و خۆراکی زۆری تێدابوو ، کیسە پارە و هەندێ کەرەسەی شەخسی کەشتیوانەکان هەروەك

خۆیان مابوونەوە ، هەردووشتن دیارنەبوون ، سەرنشینانی کەشتییەك لەگەڵ ئەو دەزگایەی کە بەرزی تەنە ئاسمانیەکانی پێدە پێوڕێت [١١]

٣.( تشرینی یەکەمی ١٩٢٠ ) پاپۆرێکی ئەڵمای دۆزرایەوە ناوی ( فریبا ) بوو .بەلام کەشتیوانەکەی لەسەر نەبوو [١٢]

٤.ساڵی ( ١٩٢١ ) دوای چەند مانگێك دیرنەمانی پاپۆر( کارۆڵ دیرینج ) دەرکەوتەوە بەلام بێ سەرنشینەکانی [١٣]

٥. ( کانوونی دووەمی ١٩٤٠ ) یەختی ( کلۆریاکۆڵت ) لەدووری ( ٢٠٠ ) میل لەباشووری ئالاباماد دەرکەوتەوە ، بەلام خاوەنەکەی لەسەر نەمابوو .

٦.( ١٩٤٤/١٠/٢٢ ) پاپۆرێکی کووبی کە ناوی ( رۆبیکۆن ) بوو دەرکەوتەوە لە نزیك کەنارەکانی فلۆریداوە ، هیچکام لە مرۆڤە سەرنشینەکانی لەسەر نەمابوو ، بەلام سەگێکی زیندووی برسی لەسەرمابوو .

٧.( ئازاری ١٩٤٨ ) یەختێکی ئەمریکایی کەناوی ( لال سیندر ) بوو دوای چەند مانگێك دیارنەما دەرکەوت بەلام بەبێسەرنشینەکانی .

) لەدووری ( ٤٠٠ )میل لە باشووری خۆئاوای بەرمۆداوە ، بەلام

٨. ( ئەیلولی١٩٥٥ ) دۆزینەوەی پارچ و پاشماوەکانی یەختی ( کوانیماIV )

لە دووری ( ٤٠٠میل ) لە باشووری خۆرئاوای بەرمۆدا، بەلام بێسەرنشینەکانی .

٩.( ١٩٥٥/١٠/١٠ ) دەرکەوتنەوەی پاپۆرێك کە ناوی ( خۆبتا ) بوو پاش ئەوەی ( ٦٠٠کم ) لەم رێگە دیاریکارووەکەی خۆی لایدابوو .

١٠. ( ١٩٦٧/١٢/٢ ) دەرکەوتنەوەی یەختی ( وتشکرانت ) لە دووریی تەنها یەك میل لە کەنارەکانی میامیەوە ، بەلام هەردوو کەشتیوانەکەی لەسەر نەمابوون .

١١. ( حوزەیرانی ١٩٦٩ ) یەختێك کە ناوی ( ڤاجابوند ) بوو ، دەرکەوتەوە ، بەلام هیچکام لەسەرنشینەکانی لەسەر نەبوو .

# باسی شەشەم
## رزگاربوان لەمەترسیەکانی ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا
## چۆن باس لە ڕووداوەکان دەکەن ؟

ڕەنگە هەندێ بەلایەوە سەیربێت کە ئایا دەبێت کەسانێك هەبن لەناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدادا تووشی مەترسی هاتن و ڕزگاریان بوبێت ؟

لەوەلامدا دەڵێین ... بەڵێ ژمارەیەك هەبوون لەبەر هەر هۆکارێك بووبێت لەو ڕووداوانە ڕزگاریانبوو، والەخوارەوە بەکورتی هەندێك لەو ڕووداوانە دەخەینە ڕوو :

١.( جۆتالی ) خاوەن کەشتیەکی ڕاوەماسیبوو ، کەشتیەکەی بەدوای پاپۆڕێکی گەورەداڕاکێشا ، شوێنی ڕوودانی کارەساتەکەی خۆرئاوای دەرگەی ( ئەندوس ) بووە ، ئەم ناوچەیە ڕووداوی زۆری لەو جۆرەی تێدا ڕوداوە ، درێژی کەشتیەکەی ( تالی )( ٢٠م ) بووە ، ئەو پاپۆڕەی کەشتیەکەی ڕاکێشاوە ( ٣٢م ) درێژبووە ، کات شەو بوو ، ئاسمان ساماڵ بوو ، ئەستێرەکان دەرەوشاونەتەوە ، کەشی ناوچەکە لەبار بووە ، سروەیەکی فێنك لە باشووری خۆراواوە هاتووە ، تالی لە کابینەکەی کەشتیەکەیدا لە خەوێکی قووڵدا بووە ، کاتێك کەشتی و پاپۆڕەکە لە باشور نزیکبوونەتەوە لەناکاو تالی بە ئاگا هاتووە و خەبەری بۆتەوە ، کاتێك هەستی کرد ئاو لە هەموو لایەکەوە هێرشی بۆ کەشتیەکەی هێناوە ، زۆر بە پەلە چاکەتی ڕزگارکردنی لەبەر کرد و بە زەحمەت لە کابینە کەشتیەکەی هاتە دەرەوە ، پاشان بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت ڕووداوەکان چۆن ڕوویانداوە ، خۆی لە قوڵای ئاوی زەریاکەدا بینییەوە ، هەرچۆنێك بێتخۆی گەیاندۆتە سەر ئاوەکە ، سەیری کرد هێشتا پاپۆڕەکە بەسەر ئاوەکەوە ماوە ، ڕێدەکات ، بەلام کەشتیەکەی ژێر ئاو خستووە ، بەهۆی ئەو زنجیرەی کە هەردوو کەشتی و پاپۆڕەکەی پێکەوە بەستبوو ، هێندەی نەمابوو کەشتیەکە

ژێر ئاو بکەوێت ، بەلاّم بەهۆی هەولّ و توانای کەشتیوانەکان توانیان زنجیرەکە لێك جیابکەنەوە ، دەریاوانە سەرپەرشتەکانی پاپۆڕەکە چاودێری ئاوی زەریاکەیان کردووە ، بەهیوای ئەوەی کە جۆتالی دەربکەوێت ، لەهەمان کاتیشدا چاودێری کەشتیەکەیان دەکرد ، کە چۆن لە ناو گێژاودا ژێر ئاو کەوتووە ، دوای نیو سەعات تالی گوێی لە کەسێك بوو کە بە بلّند بانگی کردووە ، کە گویّ ی لە ئاوی خۆی بووە وەلاّمی داوەتەوە ، پاشان دەریاوانەکان بە پەلە گەیشتونەتە سەری و ڕزگاریان کردووە ، دوای ئەم ڕوداوە دەریاوانەکانی سەر پاپۆڕەکە کۆبونەتەوە و کەوتونەتە گێڕانەوە و هەڵسەنگاندنی ڕووداوەکە ، گومان لە هیچ تێك چوون و پەك کەوتنێکی پاپۆڕەکە نەکردووە ، هەر ئەوەندەیان گێڕاوەتەوە ، کە گێژاو بە شەپۆلێکی توند هەڵیکردووە، قیبلە نما و ڕادیۆکانیان لە کار کەوتوون ، شالاّوی شەپۆلی ئاوهەموو پاپۆڕەکەی داپۆشیوە ، پاش کردنەوەی زنجیری پێکەوە بەستن کەشتیەکە توشی ئەو کارەساتە هاتووە و لە گێژاودا ژێر ئاو کەوتووە [١٢] .

٢-( دۆن هەنری ) دەریاوانێکی چوار پەل ئەستور و ئاوشان پان بوو ، تونایەکی باشی هەبوو لە کەشتیرانی و چوونە ژێر ئاودا ، زۆر لە خۆ ڕازی و باوەڕ بەخۆبوو ، لە ساڵی ( ١٩٦٦ ) دا ڕووداوێکی لیّ ڕوودا خۆی بەم جۆرە دەیگێڕێتەوە :

( ... لە گەشتێك دەگەڕاینەوە کە ٣ ڕۆژ بوو درێژەی هەبوو ، گەشتەکە لە پۆرتۆریکۆوە بۆ فورلاو دردلّ ، کەشتیەکەشمان بەدوای خۆماندا رادەکێشان کە بارەکەی ژێر ئاو کەوتبوو ، ئەو کەشتیەی بە دوای خۆماندا ڕامان دەکێشا ٢٥ تن قورس بوو ) ، دۆن هەنری درێژەی بە باسەکەی دەدات و دەڵیّ ( ....لەسەر پاپۆڕەکە بووم و چاودێری کەشتیەکەو ئاوی زەریاکەم نەکرد ، گەشتینە قولاّی ئاوی دەریاکە نزیکەی ١٠٠٠م بوو ،کاتێك پاش نیوەڕۆ بوو ئاسمان سامالّ بوو

کەشێکی لە بار باڵی کێشا بوو بەسەر ناوچەکە دا ، .... چوومە نـاو کابینـەی پاپۆڕەکەوە لە پشتەوە بە پێوە وەستابووم ، پاش چەند دەقیقەیەك گوێم لە ژاوە ژاو دەنگێکی نامۆ بوو ، دەست بەجێ لە کابینەکە ها تمە دەرەوە و چـوومە سـەرەوە ، بەهـەمووەنگی خـۆم هـاوارم کـرد چـی ڕووی داوە ؟ تەماشـایی قیبلەکانم کرد ، لەجووڵەی بەردەوام بوو بەرەو ئاڕاستەی میلی کـاژمێر، کـە ئەمەش دیاردەیەکی ناوازەو سەرسوڕهێنبوو ، بەڕواڵـەت هـیچ هۆیـەك نـەبوو کەواقیبلە نماکە ئەو جوڵەسەیرە بکات ، هەستم کـرد ڕووداوێکـی نائاسـایی ڕوویداوە ، بەڵام نەمدەزانی چییە ؟ ... نـاو لەهـەموو لایەکـەوە ، هێرشـیی دەهێنا بۆ ناو پاپۆڕەکە ، ئەوەندە زۆر خێرابوو هەستم دەکر د ئاسمـان و زەوی لەیەکیان داوە ، وامدەزانی لەدۆزەخـدام . هەسـتم دەکـر هێزێکـی نادیـارە ، بەرهـەمهێنانی وزەی کارەبـایی نـاو پاپۆڕەکـە بڕیـوە ، بەرهەمهێنـەرەکان دەسووڕان ، بەڵام وزەیان بەرهەم نـەدەهێنا ، ئەندازیارەکـەمان هەوڵیـدەدا بەرهەمهێنەرە یەدەکەکان بخاتە گەڕ، بەڵام بێ سوودبوو ، نەیدەتوانی تەنها یەك پرشنگی ئاگری لێ بەرهەم بهێنێ ، لەدڵەڕاوکێی ئـەو کەشـتییەدا بـووم کەبەدوای خۆماندا ڕامانده کێشا ، بەهۆی ئەو هەوروتەمەچڕو ئەستوورەوە کە دەمبینی ، هێشتا ئەو زنجیرەی کە پێکیـەوە دەبەسـتێن ، هـەر بەبەسـتراوەیی ماوەتەوە ، هەوڵمدا خێرایی پاپۆڕەکە زۆتر بکـەم ، بـەڵام خێـرا نـەدەبوو ، نەمدەزانی بەرەو کوێ دەچم ،... هەموو هوڵم ئەبوو کە لەو دۆزەخە ڕزگاربم ، لەوکاتەدا هەسـتمکرد هێزێـك هەیـە بـەرەو دواوە ڕامدەکێـشێ ، لەڕاسـتیدا هەوڵماندەدا لەبەستێك ڕزگـاربین کەلەتەمومـژو هـەوری چڕدروسـتبووبوو ، شە پۆلەکانی ئاوەکە زۆر بەرز نەبوون ، بەڵام ئاوەکە جووڵـەو پـشێویی زۆری پێوە دیار بوو ، ڕەنگی ئاسۆ گۆرابوو بۆرەنگی شیری ، پاشان زنجیرەکە پـچڕا ، کەشتی و پاپۆڕەکە لێکجیابوونەوە ، کەشتیەکەو بەوانەشەوە کەلەسەری بوون

دیارنەما ... لەومەوە تێگەیشتم کەناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا دیاردەی سەیرو سەمەرەی تێدا ڕوودەدات و باوەڕی تەواویشم بەوە هەیە

٣ . ئەمەش ڕووداوێکی ترە، کەبەسەرماموستایەکی زانکۆی شاری ( مەیامی ) دا هاتووە ، ئەم ماموستایە لەبواری ئەلیکترۆنە ئەندازەدا پسپۆڕە ، ڕووداوەکە لەئەیلولی ( ١٩٧٢ ) دا ڕوویداوە ، ماموستاکە دەگەڕێتەوەو دەڵێ :( ... ئەو ئێوارەیەی کارەساتەکە ڕوویدا ، لەگەڵ ( ٣ )هاوڕێمدا لەگەشتێکی راوەماسی دەگەڕاینەوە کاتێک لە کەنارەکان نزیکبووینەوە هەستمکرد لادانێکی نائاسایی لەقیبلە نماکەدا ڕوویدا ، ڕووناکی ناو کەشتیەکە لەسەرخۆ لاوازبوو ، هەتا بەتەواوەتی کوژایەوە ، لەوەدەچوو هێزێکی دەرەکی توانای پاترییەکانی لاوازکردبێت ، گوێم نەدایە بەئاراستەی قیبلە نماکە ، کەشتیەکەم بەرەو خۆرئاوا ئاراستەکرد ، پاشان لەخێراییەکەیم زۆرکرد ، بەلآم کەشتییەکەرووی لەباکوورکرد ... لەهەوڵی ئەوەدا بووم هەرچۆنێکبێت کەشتییەکە بگەیە نمە کەنار ، بەلآم بێسوودبوو ،... لەم کاتەدا خۆم و هاوڕێکانم هەستمانکرد پەڵەیەکی ڕەشی تاریك لەناو ئەستێرەکانەوە هاتە خوارەوە ، پاشان بینیمان گورزە تیشکێکی ڕووناکی بەهێز چووە ناو پەڵە تاریکەکەوە ، هەتا چەند دەقیقەیەك لەناویدا مایەوە ، دوای ئەو ماوەیە هەردووکیان دیارنەمان ... ئەوجا قیبلە نماکە گەڕایەوە باری ئاسیی خۆی ، بەرهەمهێنەرانی کارەبا کەوتنەوە کارو ناو کەشتییەکە ڕووناکبووەوە ، ئەوسا توانیمان بەرەو پێشەوە ڕێبکەین و بگەینە کەنارەکان ) شایانی باسە ڕۆژێك ماموستاکە لەیەکێك لەسیمینارەکانیدا ئەم ڕووداوەی بۆ ئامادەبووان دەگەڕێرایەوە ، وەك ڕووداوی راستەقینەو بەگەواهی ٣ کەسی تر ، کەلەگەشتەکەدا لەگەڵیبوون ، داوای تەوابوونی سیمینارەکە ، کاپتنێکی دەریایی ئەمەریکا لەنێوان ئامادەبوواندا بوو ، پەیوەندی بەماموستاوە کردو

**بۆی گێڕایەوە کەئەویش حاڵەتەێکی لەو جۆرەی بەسەردا هاتووە ، بەڵام هەتا ئێستاش بۆ کەسی نەگێڕاوەتەوە لەترسی ئەوەی نەکو باوەڕی پێنەکەن یا بەدحاڵ و کاڵفامی تێبگەن**

## پەراوێزەکانی بەشی دووەم

١ ) د. ابو الروس ، مثلث برمودا ، مصدر سابق ، ص ١٢

٢ ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٣ .

٣ ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٣.

٤ ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٤ .

٥ ) د . طالب ناهی الخفاجی ، اسرار مثلث برمودا ، مصدر سابق ، ص ١٠

٦ ) لەئینتەرنێتەوە ،

٧ ) ئەو بیست وشەش ڕووداوەی کەلەسەردیانەمانی یەخت و کەشتی و پاپۆرو نەوتکوێزەرەوە نوسراون لەو ٤ سەرچاوەیەی خوارەوە وەرگیراون ، بەلاّم گرنگەکانیان هەڵبژێردراون و پاشان بەگوێرەی بەرواری ڕووداوەکان ڕێکخراونەتەوە ، ئەو سەرچاوانەش ئەمانن

١ )خالد حامد العرفی مثلث برمودا مقبرة الاطلنطیی ، مصدر سابق ص ٤٠ _٤٤

ب ) مثلث برمودا ، پالز بیرلتز ، ترجمة الى الفارسیة ، محمد جواد باکدل ، چاپی هەشتەم ،نشرمسعو د، چاپخانەی علامه طباطبائی ، پائیز ١٣٦٩ ، ص ٦٤_ ٦٦

ج ) د . امین ابو الروس . مثلث برمودا مثلث الرعب والکوارث مصدر سابق ،ص ١٦_ ١٨

د ) مجدي محمد الشهاوي ، الاطباق الطائرة ومثلث برمودا بین الحقیقة والخرافقة ، مکتب جزیرة الورود ١٩٩٥ ص ٤٨ _٥١

٨ ) د . طالب ناهی الخفاجی اسرار مثلث برمودا مصدر سابق ص ٢٠

٩ ) هەمان سەرچاوە ی پێشوو ، ل ٢٤

١٠ ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٩

١١ ) د . امین ابو الروس مثلث برمودا مصدر سابق ص ٢٠

١٢ )خالد حامد العرفي مثلث برمودا مقبرة الاطلنطي مصدر سابق ص ٤٣

١٣ ) ههمان سهرچاوهی پێشوو ل ٤٣

١٤ ) ههمان سهرچاوهی پێشوو ل ٤٤

١٥ ) د . طالب ناهي الخفاجي اسرار مثلث برمودا مصدر سابق ص ٢٧ _٢٨

١٦ ) ههمان سهرچاوهی پێشوو ل ٢٨_ ٢٩

١٧ ) ههمان سهرچاوهی پێشوو ل ٣١_٣٢

## بەشی سێیەم

# حاڵەتەکانی دیارنەمانی فڕۆکەکان

## باسی یەکەم

## دیارنەمانی فڕۆکەکان

دیاردەیەکی سروشتیە کەبەلەم و کەشتی و پاپۆڕەکان لەئەنجامی هەرهۆکارێکدا بێت سروشتی یا مرۆیی ژێر ئاوبکەون ، بەلام ناسروشتی دەبێت کاتێک ژمارەیەکی زۆر کەشتی و پاپۆڕ لەبارودۆخێکی نادیارو ئالۆزدا دیارنەمێنن ، ناسروشتییە گەر ڕووبەرێکی ئاوی دیاریکراو ژمارەیەکی زۆری کەشتی وپاپۆڕی تێدا دیار نەمێنێ و بێسەرو شوێن بێت ، هەروەها تێکشکانی فڕۆکەو کەوتنە خوارەوەیان بەهەر هۆکارێک بێت دیاردەیەکی ئاسایی و سروشتیە ، بەلام کاتێک نائاسایی و ناسروشتیدەبێت ، کەئەو دیاردەیە لەئاسمانی ئەو ڕووبەرە ئاوییەدا ڕوودات کەزۆرترین دیاردەی دیارنەمان و ژێرئاوکەوتنی کەشتی و پاپۆڕەکانی تێدا ڕوویاندا بێت ، مرۆڤ هەر لەسەرەتاوە بیرلەوەدەکاتەوە ، کەئاخۆ پەیوەندی هەبێت لەنێوان هەوای سەر سێگۆشەی بەرمۆداو ئاوەکەیدا ؟ یان ئەو هێزە نادیارەی کە لەناو ئاوی سێگۆشەی بەرمۆدادا کاردەکات هەرهەمان هێز کاریگەریشی لەسەر ئەو چینە هەوایە هەیە کەفڕۆکەکان پیایدا دەفڕن ؟ لەڕووداوەکانی دیارنەمانی فڕۆکەکاندا زۆر بەدەگمەن ڕێککەوتووە پارچەو پاشماوەی ئەو فڕۆکانە لەناوی زەریاکەدا دۆزرابنەوە یان تەرمی تەنها یەك فڕۆکەوان ، یان سەرنشینێکی ئەو فڕۆکانە دۆزرابێتەوە ، گەر فڕۆکە لەئاسماندا تووشی ڕووداو هات ، نابێت پارچەو پاشماوەکانی بکەونە سەرزەوی ، یان ناوڕووبەرە ئاوییەکان ؟ ئەی بۆچی زۆرینەی هەرە زۆری ئەو فڕۆکانە هیچ پاشماوەو

پارچە یان لەسەر یان لەناو ئـاوی زەریاكـەدا بەجێنـەماون ؟ژمارەیـەكی زۆر فڕۆكە لەجۆری جیاوازو سەربە دەوڵەتی جیاواز لەجۆری سەربـازی و گواستنەوەی مەدەنی سازو ئامادەكراو بەهەممو هۆیەكانی تەنگانەو لێقەومان و كـاتی فریـاگوزاریی ، وەك چـەتری ڕزگـاربوون ، هۆیـەكانی پەیوەنـدی ، ئامێرو دەزگاكانی ئاگاداركردنەوە ی پێشوەخت ، سووتەمەنیی تەواو ... هتـد ئەی بۆ بەو ژمارە زۆرە لەئـاسمانی سێگۆشە بەرمۆدادا دیارنـامێنن ؟لـەخوارەوە بـەروارو جـۆری هەنـدێك لەوفڕۆكـانـە ی لـەئاسمانی سێگۆشـەی بـەرمۆدەدا دیارنەماون ، یان تێكشكاون ، وەك نموونەدەخەینەڕوو :

١ ) ( ١٩٤٥ /١٢/٥ ) دیارنەمانی ( ٥ ) فڕۆكەی ئەمەریكایی ، سەربەهێزی دەریایی ئاسـراو بەسـربی ١٩ ، لەگـەڵ ئـەو فڕۆكەیەشـدا ، كەچـووبوو بۆرزگاركردنیان ،( لەبەرگرنگی ئەم ڕووداوە لەباسەكانی داهـاتوودا جـارێكی تر دەگێرنەوە سەر ئەم باسە )

٢ ) ( ١٩٤٧/٧/٣ ) دیارنـەمانی فڕۆكەیـەكی جـەنگی ئەمـەریكایی جـۆری ٤٥ بەدەستەكەیەوە كەژمارەیان ٦ كەسبوو ، لەگەشتەكەیدا بوو لەنێوان بەرمۆداو ( بالم بیتش ) دا لەدووریی ١٥٠ كم لەبەرمۆداوە دیارنەما .

٣ ) ( ١٩٤٨/١/٣٠ ) ، دیارنەمانی فڕۆكەیەكی نەفەرهەڵگری ئەمەریكایی جـۆری ( ستـارتـایگەر ) كەلەگەشتێكدا بـوو لـە ئەزۆریـسەوە بـەرمو بـەرمۆدا ، جگـە لەدەستەی فڕۆكەوانـەكان كـە ژمارەیـان ٦ كەسـبوو ٣١ سەرنـشینی تریـشی تێدابوون

٤ ) ساڵی ( ١٩٨٤ ) دیارنـەمانی فڕۆكـەی جـۆری ( تیـۆدۆر ٤ ) كـە فڕۆكەیـەكی گەورەی ٤ پەروانە بوو بەخۆی و ٣١ سەرنشینەوە

٥ ) ( ١٩٤٨/١٢/٢٨ ) دیارنـەمانی فڕۆكەیـەكی نەفەرهـەڵگر لـەجۆری ( ) كەلەگەشتێكدا بوو لەسانجوانەوە بەرمو مەیامی ٣٦ كەسی تێدابوو

٦ ) ( ١٩٤٩/١/١٧ ) دیارنەمانی فڕۆکەیەکی نەفەرهەڵگر جۆری ( ستارئاریل ) لەدووری ٣٨٠ میل لەباشووری خۆرئاوایی بەرمۆداوە کە لە گەشتێکدا بوو بۆسانتیاگۆ شیلی بەڕێگای بەرمۆداو جامایکادا جگە لەدەستەی فڕۆکەوانەکان کە ٧ کەسبوون ٣٠ کەسیشی لەناودابوو

٧ ) دیارنەمانی فڕۆکەیەکی تر هەر لەجۆری ( تۆیۆدۆر ٤ ) بێئەوەی هیچ ئاسەوارێکی لە پاش بەجێبمێنێ .

٨ ) دیارنەمانی فڕۆکەیەکی نەفەرهەڵگری گەورەی ئەمەریکایی ، جۆری ( گلۆپ ماستەر ) لەباکووری سێگۆشەی بەرمۆدادا کە لەگەشتێکا بوو بەرەو ئیرلەندا .

( ١٩٥٢/٢/٢ ) دیارنەمانی فڕۆکەیەکی نەفەرهەڵگر ی ئەمەریکایی بەناوی ( یۆرك ترانس پۆرت ) لەباکووری سێگۆشەی بەرمۆدادا جگە لەفڕۆکەوانەکان ٣٣ کەسیشی لەناودابوو .

١٠ ) ( ١٩٥٤/١٠/٣٠ ) فڕۆکەیەکی وشکاوەکی ( برمانی ) بەناوی ( لوکهید ) کەسەربە هێزی دەریایی ئەمەریکا بوو ، جگە لە دەستەکەی ٤٢ سەرنشینی تری تێدابوو

١١ ) ( ١٩٥٦/١١/٩ ) دیارنەمانی فڕۆکەیەکی ووشکاوەکی ئەمەریکایی جۆری ( مارتی ٥ ) کەسەربە هێزی ئاسمانیی ئەمەریکابوو ، بەخۆی و دەستەکەیەوە کەژمارەیان ٢٠ کەسبوون

١٢ )( ١٩٥٦/٤/٥ ) دیارنەمانی فڕۆکەیەکی جۆری٢٥ کە٣ کەسی تیابوو

١٣ ) ( ١٩٦٢/١/٨ ) دیارنەمانی فڕۆکەیەکی جەنگی ئەمەریکایی جۆری ٥٠ سەربە هێزی ئاسمانی ئەمەرکایی بوو، لەگەشتێکدا بوو لەفڕۆکەخانەی ( لانگلی ) بەرەو دورگەکانی ئازور

١٤ ) ( ١٩٦٣/٢/٢٢ ) دیارنەمانی فڕۆکەیەکی نەفەرهەڵگر ( ١٢٣ ) لەڕێگەیدا بەرەو دورگەی ئەزۆر یس

١٥ ) ( ١٩٦٣ ) دیارنەمانی دوو فڕۆکـەی مەشـق و ئازووقــە ، کەسـەربە هێـزی ئاسمانی ئەمەریکا بوون ، لەجۆری ستراتۆ.

١٦ ) ( ١٩٦٣ ) تێکشکانی فڕۆکەیەکی گواستنەوە لـەجۆری ( ٥ ) لەسـەر سێگۆشەی بەرمۆدا لەباردۆخێکی ئالۆزو نادیاردا .

١٧ ) ( ١٩٦٣/٨/٢٨ ) دیارنــەمانی دوو فڕۆکـەی جـۆری ( ١٣٥ _ ) سـەربە هێزی ئاسمانی ئەمەریکا لەدووری ٣٠٠ میل لەباشووری خۆرئاوای بەرمۆدادا .

١٨ ) ( ١٩٦٥/٦/٥ ) دیارنــەمانی فڕۆکەیــەکی بارهــەڵگر لــەجۆری ( ١١٩ ) لەباشووری خۆرهەڵاتی باهاما .١٠ سەرنشینی لەناودابوو .

١٩ ) ( ١٩٦٧ ) دیارنەمانی فڕۆکەیەك کەسەر بە پاسەوانانی سنووربوو .

٢٠ ) ( ١٩٦٧ ) دیارنەمانی فڕۆکەیەکی سەربازی لەجۆری ( ١٢٢ )

٢١ ) ( ١٩٦٧/١/١١ ) دیارنەمانی فڕۆکەیەکی سەربازی هەر لەجۆری ( ١٢٢ )

٢٢ ) ( ١٩٧٠ ) دیارنــەمانی فڕۆکەیــەکی نەفەرهــەڵگری فەڕەنــسایی ( میــتلتن یاتریدس )

٢٣ ) ( ١/١ /١٩٧٣ ) دیارنەمانی فڕۆکەیەکی تایبەت کەلەگەشتێکی کورتدا بــوو لەناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا .

٢٤ ) ( ١٩٤٧/٢/٢٧ ) دیارنــەمانی فڕۆکەیــەکی جــەنگی ، لــەدووری ٩٠٠ میــل لەباشوری خۆرئاوایی ئەزۆریسەوە .

# باسی دووەم
## نموونەیەکی سەرسوورهێن لەدیاردەی فڕۆکە دیارنەمان :

هەندێك دیاردەی سەرسوڕهێنەر و نامۆ لەڕووداوی فڕۆکە دیارنەمانەکاندا ڕوویانداوە ، والە خوارەوە وەك نموونەیەك لەو حاڵەتە سەرسووڕهێنەرانە دەخەینەڕوو :

لە ( ١٩٤٥/١٢/٥ ) دا لەسەعات ٢,٠٠ ی پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەدا سربێك فڕۆکەی بۆمبهاوێژ کەبەسربی ١٩ دەناسران ، لەئەرکێکی مەشقکردنی ڕۆتینی ڕۆژانەدا بوون ، هەریەك لەوفڕۆکانە ئەفسەرێکی فڕۆکەوان و دوو یاریدەدەری تێدابوون ، سووتەمەنی تەواویان تێدابوو ماوکەی ٥٠٠ میل بووە ، ئەو پێنج فڕۆکەیە لەبنکەی دەریایی ( فۆرت لۆردال ) ەوە لەفلۆریدا لەسەعات _٢,٠ دووی تەواودا هەڵسان ، گەشتەکە بەچاودێری ( چارلز تێلەر ) دابوو پاش ١٠ دەقیقە هەر ( ٥ ) فڕۆکەکە لەئاسماندا بوون ، بەشێوەی سێگۆشەیەك بەئاسماندا دەفڕین ، ملازم تێلەر لەنووکی ئەو سێگۆشەیەدا دەفڕی ، ( ڕەنگە ئەمە هۆبووبێت بۆ ناونانی ناوچەی بەرمۆدا بەسێگۆشەی بەرمۆدا وەك لە پێشووتر داو بەدرێژای باسی لێوە کرا ) ، سەرکردەی سربەکەم تێلەر فڕۆکەوانێکی شارەزاو لێهاتوو بوو ، زیاتر لە ٢٥٠٠ سەعات بەئاسمانداو بەفڕۆکە فریوە ، فڕۆکەوانەکانی تریش ئاستێکی باشیان هەبووە لەکارەکەیاندا .لەم گەشتەدا ١٤ کەس هاوبەشیان کردووە ، کەسی پانزەهەم ( ئالان کۆستار ) بوو کە ئەو ڕۆژە لەسەر داوای خۆی هاوبەشیی گەشتەکەی نەکر ، سربەکە ماوەی ١١٠ کم بەرەو خۆرهەڵات دوورکەوتنەوە ، بڕیاریشبوو

زۆرتر بەرەو خۆرهەلآت دووربکەونەوە ، دواتر بابدەنەوە بەرەو باکوور دوای ئەوەش بەرەو خۆرئاو، دوای تەواکردنی ئەو سێگۆشەیە لەسەعات _٤، ی تەواو دەگەڕانەوە بۆ بنکەکەی خۆیان ، بەلآم لەسەعات ٢,٤٥ دەقیقەدا لەکاتێکدا بنکەکە چاوەڕوانی نامەیەکی ئەوانبوو سەبارەت بەگەشتەکەو گەرانەوەیان ، بورجی چاودێری گەشتەکە ئاماژەیەکی لەسربەکەوە وەرگرت ئەوەی پیشان دەدا کە سربەکە تووشی گرفتێك هاتووە ، ئەو نامەیەش لەتێلەری سەرکردەی سربەکەوەبوو ، لەوئاماژە کورتەوە دەرکەوت کەسربەکە رێگاکەی خۆی بزر کردووە ، ناشتوانێت رووی ئاوەکە_ خوارەوە _ ببینێت و شوێنەکەی خۆی دیاری بکات ، هەر لەو ئاماژەیەشدا دەردەکەوت کە قیبلە نماو دەزگاکانی سەرکردایەتی ئوتوماتکی ناو فرۆکەکان کارناکەن لەسەعات ٢,٤٥ دەقیقەدا تێلەر نامەیەکی سەیری ئاراستەی بنکەکە کرد ( ... تێلەر بانگی بنکە دەکات ... ئێمەلەحاڵتێکی نائاساییداین ...وادەردەکەوێت کەئێمە لەدەرەوەی هێلی دیاریکراو دەفڕین ... ناتوانم زەوی ببینم ... ناتوانم زەوی ببینم ... ) بنکەکە : بەوردی بۆمان دیارییکە تۆلەچ شوێنێکدایت ؟ تێلەر : ( ناتوانم شوێنەکەم دیارییکەم ... تەنانەتنازانم ئێمە لەکوێداین ... پێم وایە لەبۆشاییدا بزر بووین ) بنکەکە : بەردەوامبە لەسەر ئاڕاستەکردنی فرۆکەکان بەرەو خۆرئاوا )تێلەر ( ... نازانم خۆرئاوا دەکەوێتەچ ئاراستەیەکەوە ... هەموو شتێك سەیرو ئالۆزە ، ناتوانم هیچ ئاراستەیەك دیاری بکەم ، تەنانەت زەریاکەش لەبەرچاوم نامۆیەو ناتوانم هیچ دیارییکەم ) ئەم پەیوەندیەی نێوان بنکەکەو سربە فرۆکەکە لەناو بەرپرسانی بنکەکە داوەك هەورە تریشقە دەنگیدایەوە ... دواتر ناو بەناو ئاماژەی کورتی فرۆکەکانی تریان وەردەگرت ، کەلەناو خۆیاندا قسەیان

دەکرد ، هەندێ ڕستەو دەستەواژەیان بۆ ساغبوونەوەمو تێیا ندەگەیشتن ، لەوانە ( ... هەموو دەزگاکانی ناو فرۆکەکە شێتبوون هەریەکەیان بەجۆرێك دەخولێتەوە کە لەوانی تر جیاوازە ... ) پێش دوانامە ئاماژەیەکی تری نێوان فرۆکەوانەکانیان وەرگرت کە هێشتا هەرباس لەوەدەکەن نازانن لەکوێدانن و بارودۆخەکە چۆنە لەمەوە دەردەکەوێت کەهەر ( ٥ ) فرۆکەکە ڕێگەیان بزرکردووە بەئاراستەی هەڵەدا ڕۆشتوون . دوائاماژە کەبنکەکە لەفرۆکەوانەکانەوە وەریگرتبووە دەڵێت ( ... وادەردەکەوێت کەئێمە لەفریندا ین هەربەردەوامین ... وادەردەکەوێت کەبەسەر ئاوێکی سپیدا دەفرین ... بەتەواوەتی بزربووین ... بەڵێ بزربووین ) پاشان هەوڵەکانی فریاکەوتن و ڕزگارکردن دەستیانپێکرد ، فرۆکەیەکی گەورەی فریاکەوتن لەجۆری ( مارتن مارینز )ی دوو پەروانە ، کە١٣ ( هەندێك سەرچاوە دەنووسن ٣٠ ) پسپۆڕو شارەزای تێدابوون ، وەنوێترین ئامێرو دەزگای پشکنین و پەیوەندیی هەلگرتبوو ، پاش چەند دەقیقەیەك بورجی چاودێرییەکە نامەیەکی لەم فرۆکەیەوە پێگەیشت کە ئەوە دەردەخات کەشی ناوچەکە لەبار نییە ، بایەکی زۆر توند هەیە ، تەنانەت لەبەرزایی ( ٦ ) هەزار پێوە ، دەریا لەشە پۆ ل و جووڵەدایە ، هەرلەسەعات _٦، ی ئێوارەوە تاریکی باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشاوە ، پاشان لەنێوان بورجی چاودێرییەکەو فرۆکە فریاگوزارییەکەدا پەیوەندی نەما ، هەتا ئێستاش پەیوەندی نیە ...!!! بۆرۆژی دوایی ، لەگەڵ ڕۆژهەلاتنا گەورەترین هەڵمەتی گەران و پشکنین بەدوای ئەو ( ٦ ) فرۆکەیەدا دەستپێکرد ، ( ٣٠٠ ) فرۆکەی هەمەجۆر ، ( ٦٧ ) فرۆکە هەلگر ( ٤ ) مودەمیر سەدان کەشتی و پاپۆڕ ژمارەیەك ژێردەریایی ، ئەمانە هەموو کەوتنە گەران و پشکنین و سۆراخ ڕووبەرێکی گەورەی ناوی

زەریای ئەتڵەسی و دەریای کاریبی و ناوچەیەکی گەورەی کەنداوی مەکسیکیان پشکنی کە کۆی هەمووی بە ( ١ ) یەك ملیۆن کم مەزەندە دەکرێ ، ماوەی گەڕان و پشکنینەکە بەبەردەوامی نزیکەی ( ٤١٠٠ ) سەعاتی خایاند ، بەلآم بێسوود بوو ، هیچ پاشماوەو ئاسەوارێکیان نەلەو ( ٦ ) فرۆکەیە دەستکورت نە لەسەرنشینەکانی ، شایانی باسە لەم ساڵانەی دوایدا و دوای تێپەڕبوونی ( ٤٧ ) ساڵ بەسەر ئەو ڕووداوەدا ، پاشماوەی ( ٥ ) فرۆکە بۆمبهاوێژەکان دۆزاریەوە ، بەلآم بێسەرنشینەکانی کەژمارەیان ١٤ کەسبوو

## باسی سێیەم

## ئەو فرۆکەوانانەی لەمەتر سییەکانی ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا رزگاریانبووە چۆن باس لە رووداوەکان دەکەن :

وەك چۆن لەرووداوەکانی کەشتی و پاپۆڕەکاندا کەسانێك هەبوون لە مردن رزگاریان بووبوو ،دواتر رووداوەکەیان دەگێڕانەوە ، ئاوەهاش لەرووداوەکانی فڕۆکەدا کەسانێك هەبوون توشی ئەو مەترسیانە هاتوون ، بەهەر هۆکارێك و هەرچۆنێك بووە رزگاریان بووە ، دواتر بونەتە شاهد حالْ و وردەکاری و نهێنیەکانی ئەو بەسەرهاتەی خۆیان و تێکڕای رووداوەکەیان گێراوەتەوە ، والەخوارەوە دوو نموونە لەزمانی ئەو کەسانەوە دەخەینەروو :

١. دیك شتێرن سەرکردەی سربێکبوو کەلە ( ٧ ) فرۆکەی بۆمبهاوێژ پێکهاتبوو ، لەسالْی ( ١٩٤٤ ) دابەفەرمانێکی رەسمی بەرەو دورگەی بەرمۆدا دەرچوو . دەلْێت ( ٤٨٠ ) کم مابوو بگەمەوە دورگەی بەرمۆدا کەش و هەوا لەبار بوو ، بەلاّم کتوپڕ فرۆکەکەم توشی پشێوی هات ... هاوسەنگی فرۆکەکە تێکچوو سەروبن هەلْگەرایەوە ،سەری من و یاریدەرەکان بەر سەقفی فرۆکەکە کەوتن ... فرۆکەکە ئەوەندە نزمبووەوە ،هێندەی نەمابوو بەر لە ئاوی زەریاکە بکەوێ ، بەهەر جۆرێکبوو توانیم فرۆکەکە راستبکەمەوە ، بگەرێمەوە بۆ بنکەکە ... لەم ماوەیەدا هیچ پەیوەندیەکم لەگەلْ سربەکەدا نەمابوو ، کەگەرامەوە بنکەکە ، لەوێ زانیم کە پەیوەندی بێسمی نێوان بنکەکەو ( ٦ ) فرۆکەکەی تر نەماوە ، هەتا ئێستاش هەر هەوالْیان نییە ، بێسەروشوێنن ) ئەو ( ٦ ) فرۆکەیە لەبارودۆخێکی ئالْۆزو نادیاردا بێسەرو شوێن بوون ، چوونکە ئەم رووداوە لەسالاّنی جەنگی دووەمدا بوو ، بۆیە هێندە گوێی پێنەدراو خرایە پالْ زیانەکانی جەنگ

٢. ( جاك واكیلی ) فرۆکەوانێکی بەتواناو لێهاتوو بوو ، لە سەرکردایەتیکردنی فرۆکەدا شارەزایی ( ١٠ ) ساڵی هەبوو ڕووداوێکی بەسەرهاتووە بەم جۆرەی دەیگێڕێتەوە :

لەتشرینی یەکەمی ( ١٩٦٤ ) دا ، وەك فرۆکەوانێك لەکۆمپانیایەکی فرۆکەوانی لەشاری مەیامی کارمدەکرد ، گەشتێکم پێسێردرا کە بریتیبوو لەگەیاندنی ژمارەك گەشتیار بۆ ( ناسۆ ) دواتریش راستەخۆ بگەڕێمەوە ... گەشتیارەکانم گەیاندن ... کەتاریکی داهات فرۆکەخانەی ناسۆم بەجێهێشت ، کەش و هەوا لەباربوو ... مەودای بینین زۆر باشبوو ، لەسەعات ( ٩,٥ ) دا بەبەشی باکووری دورگەی ( ئەندرس ) دا تێپەڕیم ، رووناکی هەندێ شوێنی دورگەکەم دەبینی ، باری گونجاوی ناسۆی خۆمم وەرگرت ، گەیشتبوومە بەرزایی ( ٢٤٠٠ ) ماوەی نزیکەی ( ٨٠ کم ) م ئەندرسەوە بڕیبوو بەرەو ( بامینی ) دەهاتم ، سەرنجمدا دیاردەیەکی نامۆو سەیر لەسەر باڵی فرۆکەکە هەیە ، ئەویش ( لەسەرەتاوە شەوقی ڕووناکییەکی لاوازبوو ، سەرەتا وام دەزانی بینینە فێڵە( خداع بصری ) بەلآم هەتا دەهات شەوق و رووناکییەکە زۆرتر دەبوو ، لەماوەی ( ٥ ) دەقیقەدا هێندە رووناکبووەوە ، نەمدەتوانی دەزگاکانی پێوانەکردنی بەردەوامم بخوێنمەوە ، قیبلە نماکە بەهێواشی دەستیکرد بەجوولآن ، پێشتر ئامازەکەری سوتەمەنییەکە لەسەر نیوە بوو ، بەلآم دواتر وای پیشاندەدا کە پڕە ، کارو دەزگا ئۆتۆماتیکیەکانی ناو فرۆکەکە پەکیانکەوت و لەکارکردن وەستانی فرۆکەکەم بەدەست لێدەخوری . وام هەستدەکرد ئەو شەوق و ڕووناکیە ی ناو فرۆکەکە لەسەرچاوەیەکی دەرەکییەوە نەبوو ، بەڵکولەناو خودی فرۆکەکە خۆیەوە بوو ، شەوقەکە زۆرتربوو دەرەوەم نەدەبینی ،تا وام لێهات بەهەڕەمەکی و بەبێهیچ زانیارییەك فرۆکەکەم دەبرد بەرێوە ، دوای تێپەڕبوونی چەند دەقیقەیەك ڕووناکییەکە بەرەو کزی و لاوازی دەچوو ،

دواتر بەیەکجاری نەما ، دوای نەمانی ڕووناکییەکە دەزگاو ئامێرەکانی ناو فڕۆکەکە کەوتەوە کارو نیشاندەری سووتەمەنییەکەش لەسەر دەوروبەری ناوەڕاست وەستایەوە



## پەراوێزەکانی بەشی سێیەم

١. ئەو ( ٢٤ ) ڕووداوەی دیارنەمانی فرۆکەکانی لەو ( ٤ ) سارچاوەیەوە وەرگیراون کە لـەخوارەوە ئاماژەیـان پێکـراوە ، بـەڵام گرنگـەکانیان هەڵبـژێردراون و بەگوێرەی مێژووی ڕوودانی حاڵەتەکان ڕێکخراونەتەوە .

ا.خالد حامد العرفي ، مثلث برمودا مقبرة الأطلنطي ، مصدر سابق ،ص ٣٧_٣٩

ب. چـارليز بێرالتـز ،مثلـث برمـودا ، ترجمـة الى الفارسـية محمـد جـواد پاكدل ،مصدر سابق ، ص ٦٢_٦٤

ج. د. امين ابوالروس ، مثلث برمودا مثلث العرب والكوارث مصدر سابق ،ص ٣٠ _٤٠

د. مجـدي محمـد الـشهاوي ، الأطبـاق الطـائرة ومثلـث برمـودا بـين الحقيقـة والخيـال ، مصدر سابق ص٥١_٥٤

٢. طالب ناهي الخفاجي ، اسرار مثلث برمودا ،مصدر سابق ،ص٣٤_٣٩ بەڵام بەکورتکردنەوە .

٣.سەرچاوەی پێشوو ،ل ٥١ _٥٢

٤. سەرچاوەی پێشوو ،ل ٥٣_٥٤

## بەشی چوارەم

# ناوچە سەرسوورهێنەرو نامۆکانی تری جیهان

## باسی یەکەم

## ئەو ناوچانەکامانەن؟

لەسەرنجدانی ڕووداوە سەیرو سەرسوورهێنەرەکان ، لە ناوچوون و لەدیارنەمانی کەشتی و پاپۆرو فرۆکەکان لەبارودۆخێکی نادیاردا ، دەرکەوتووە هەربەتەنها سێگۆشەی بەرمۆدا نیە ئەو جۆرە ڕووداوە سەیرو ئالۆزانەی تێیدا ڕوودەدەن لەم ڕووەوە زانای ئەمەریکایی ئیڤان سندرەسن بیردۆزێکی پێشکەش کرد لەساڵی (١٩٦٠) دا سەبارەت بەناوچە نامۆو مەترسیدارەکانی جیهان ، لەو بیردۆزەدا ساندرسن ئەوەی ڕاگەیاند کە ئەو دیاردەو ڕووداوانەی لەو دوانزە ناوچەیەی جیهاندا ڕوودەدەن ناوازەن بە بەراوردکردن لەگەڵ ڕێساو یاسا سروشتییەکاندا ، ئەو (١٢) ناوچەیەی ساندرەسن دیاریکردووە بەسەر هەموو گۆی زەویدا دابەشبوون یەکێکیان لەجەمسەری باکوورەو یەکێکیان تریان لەجەمسەری باشوورە (١٠) ناوچەکەی تر بەدوو ریز ریز بوون ریزێکیان لەخوار بازنەی پانی (٤٠) باکور ریزەکەی تریان لەسەرووی بازنەی پانی (٤٠) باشوورو لەنێوان هەر ناوچەیەك و ناوچەیەکی تردا (٧٢) هێڵی درێژی هەن دووان لەو شوێنانە دەکەونە سەرو وشکانی و (١٠) شوێنەکەی تر لە ڕووبەرە ئاوییەکاندان (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٣)

ئەو (١٢) ناوچەیەش ئەمانەن :

١.سێگۆشەی بەرمۆدا

٢.دەریای شەیتان (دەریای ژاپۆن)

٣. جەمسەری باکور

**٤. جەمسەری باشور**

**٥. ناوەڕاستی زەریایی هیندی**

**٦. خۆرهەلاتی ئوسترالیا**

**٧. باکووری نیوزیلاند**

**٨. ناوەڕاست و باکووری زەریای پاسفیك لەنێوان دەریای شـەیتان و سێگۆشـەی بەرمۆدادا**

**٩. خۆرهەلاتی بەرازیل و ئۆرۆگوای**

**١٠. باکووری خۆرئاوای ئەفەریقا**

**١١. خۆرهەلاتی ئەفەریقا**

**١٢. دەوروبەری ئەفغانستان**

**جێگەی سەرنجە کەزۆرینەی ئەم ناوچەیەکە زۆرینەی ئەم ناوچـانە دەکەونـە خۆرئاوای وشکانییە گەورەکانی کەلەم ناوچەیەدا تەوژمە دەریاییە گەرمـەکان بەرەو باکوور دەڕۆن ، لێکدەدەن لەگەلّ ئـەو تەوژمـە ساردانەیبەرەو باشـور دەڕۆن ، ئـەم ناوچـانە وەك گرێیـەکی دەردەکـەون ، تەوژمـەکانی سـەرڕووی ئاوەکان بەناڕاستەیەك دەسوڕێنەوە ، ئەوانەشی کەراستەو خۆ لـەخوارو ڕووی ئاوەکەوەن _ لـەژێرترەوەن _ بەناراسـتەیەکی تـر دەسـوڕێنەوە ، ئەوانـەی دووەمیان تەوژمی زۆر گەورەیان لێدروستدەبێت**

## باسی دووەم

## کورتەباسێك دەربارەی دەریای شەیتان (دەریای ژاپۆن )

دەکەوێتە باکووری خۆرئاوایی ژاپۆنەوە ، لەزەریای پاسفیکدایە ، لەنێوان ژاپۆن و دورگەکانی ( بۆنین ) یان بەورتر لەنێوان ( ئایوجیما ) و دورگەی ( مارکۆس ) دایە ئەم دەریایەش وەکو دەریایی سارجاسۆ شوێنی دیارنەماون و تێکشکان و لەناوچوونی کەشتی و پاپۆرو فڕۆکەیە ، هەرلەکۆنەوە خەڵکی ناوچەکە هەستیان بەمەترسی ئەم دەریایە کردووە ،لەگەشتەکانیاندا خۆیان لێلاداوە، راوچییەکان بەدەریایەکی شووم مەترسیداریان لەقەڵەمداوە ، دەیانگوت شەیتان و جنۆکە و بوونەوەری نامۆو سەیرو سەمەرەی تێدایە ، هەرلەبەر ئەمەشە ناونراوە ( دەریای شەیتان ) باروودۆخی دیارنەمان و بزربوونی کەشتی و پاپۆرو فڕۆکەکان لەم دەریایەدا هەروەك ئەو بارودۆخەی سێگۆشەی بەرمۆدا وایە ، نە پاشماوە ، نەئاسەوار ، نەهۆیەکی دیارو ئاشکراو روون ( بڕوانە نەخشەی ژمارە ٤ )

شایانی باسە حوکمەتی ژاپۆن بەڕەسمی ئەم دەریایەی بە ناوچەیەکی مەترسیدار لەقەڵەمداوە ، هەرلەسەرەتای ساڵی ( ١٩٥٥ )دا ئەمەی راگەیاندووە ، لەم کاتەدا کەهێشتا حوکمەتی ئەمەریکا بەڕەسمی سێگۆشەی بەرمۆدای بەناوچەیەکی مەترسیدار دانەنابوو ، هەتائێستاش هەر نەیکردووە ، لەنێوان ساڵانی ( ١٩٥٠ _١٩٥٥ ) دا ( ٩ ) نۆ پاپۆری نوێ لەم دەریایەدا بەخۆیان و سەرنشینەکانیانەوە لەبارودۆخێکی نادیارو ئاڵۆزدا وەك ئەوانەی سێگۆشەی بەرمۆدا بێسەروشوێنبوون ، لەساڵی ( ١٩٥٣ ) داحکومەتی ژاپۆن دەستیکرد بەلێکۆڵینەوەو توێژینەوە لەسەر حاڵەتەکانی دیارنەمانی کەشتی و پاپۆڕەکان لەم دەریایەدا .

نێرد:راوەیەکی زانستی ناردە ناوچەکە بۆ گەڕان و پشکنین و کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر بارودۆخەکانی دیارنەمانی پاپۆڕ و فرۆکەکان بۆ ئەم مەبەستە پاپۆڕێکی تایبەتی ساز و ئامادە کرابوو پاپۆڕەکە ناوی (کێومارمۆ-٥) بوو ژمارەیەکی زۆر زانا و پسپۆڕی لەسەربوون ئەم پاپۆڕە و تیمە نەك هیچ زانیاریەکیان لەسەر ئەم دەریایە کۆ نەکردەوە بەڵکو لەبارو دۆخێکی نادیار و ئاڵۆزدا پاپۆڕەکەو سەرنشینەکانیشی دیار نەمان بێ ئەوەی هیچ پاشماوە و ئاسەوارێکیان لە پاش بەجێ بمێنێ .

سێگۆشەی بەرمۆدا و دەریای شەیتان لە هەندێ خەسڵەت دا لەیەك ئەچن لەو خەسڵەتانە .

١- دیار نەمانەکان لە هەردوو ناوچەکەدا لە بارووودۆخێکی نادیار و ئاڵۆزدا روویان داوە

٢-لەهەردوو ناوچەکەدا دیار نەمان هۆیەکانی کەشتی رانی دەریا و ئاسمانیشی گرتۆتەوە .

٣- لەزۆرینەی حاڵەتەکاندا هیچ پاشماوە و ئاسەوار لەناوچەکەدا دەرنەکوتوون .

٤- لە هەردوو ناوچەکەدا وەستان و پەککەوتنەکان قیبلە نما و رادیۆ و هۆیەکانی پەیوەندی کردنیان دەگرتەوە.

٥- لەکۆتای خۆرئاوای سێگۆشەی بەرمۆدادا لەسەر هێلی درێژی٨٠ پلە باکوری جوگرافی و باکوری موگناتیسی جوت ئەبوون ئەمەش لەدەریای شەیتاندا روودەدات . لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازی جوگرافیای زۆر هەن لەنێوانیاندا کەواتە لە هەردوو دەریاکەدا قیبلە نماکە باش و دروست ناخوێننەوە دەچنە بارودۆخێکی دور لە راستی .[٤].

## پەراوێزەکانی بەشی چوارەم

١- خالد حامد الحرفي ، مثلث برمودا موقبرت الاطلنطى مصدر السابق ص ١٨-١٩

٢-د. طالب ناهى خفاجي . اسراس مثلث برمودا مصدر سابق ص٦٩

٣- سەرچاوەی پێشوو ل٧٠

٤-د. ايمن ابو الروس مثلث برمودا مثلث الرعب وكوارث ، مصدر سابق ، ص٦٣.

# بەشی پێنجەم
# هۆیەکانی دیارنەمان و بزربوونی پاپۆڕ و فڕۆکەکان لە ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدادا .

**پێشەکی :**

بابەتی سێگۆشەی بەرمۆدا و ئەو ڕووداوانەی لە ئاسمان و سەر ئاوی ئەم ناوچەیە ڕوودەدەن بوونەتە یەکێك لە بابەتە سەرنج ڕاکێش و هەست بزواندنی ژمارەیەکی زۆری خەڵکی ، بۆیە بەردەوام کەسانێك هەیە دەگەڕێ و وێڵێ ئەو هەواڵەو باسانەیە کەلەسەر ئەم ناوچەیە بلاّ و ئەکرێنەوە ڕەنگە ئەوە هەر لە بناغەوە سروشت و خولیای مرۆڤ بێت مرۆڤێك کە حەز بکات لە نهێنییەکانی سروشت تێ بگات بەتایبەتی ئەو دیاردانەی سەیر و نامۆن یان ترسێکی شاراوە بن لەنێو دڵی مرۆڤدا کە لە هێزە سورشتیەکان دەترسێ و وە بەدوای خۆ پارێزی دا دەگەڕێتە کەر باس لە دیاردە و ڕووداوەکانی سێگۆشەی بەرمۆدا دەکرێت زۆربەی خەلکی هەندێ پرسیار ئەکەن کە وەلاّمی هەندێکیان لە ئێستادا زۆر گرانە یان ڕەنگە وەلاّم نەدرێتەوە لەوانە

ئایا ڕاستە ئەو ژمارە زۆرە لە پاپۆڕ و فڕۆکە لەو ناوچەیەدا دیار نامێنن ؟

ئایا ڕاستە ئەو دیار نەمان و بزربوونانە لە بارودۆخێکی ئاڵۆز و نادیاردابوون .

ئایا ڕاستە لەزۆرینەی هەرە زۆری ڕووداوەکاندا بەتەنها سەر نشینەکان دیار نامێن ؟ئایا ڕاستە لە هەندێ حاڵەتدا مرۆڤە سەرنشینەکان دیارنەماون بەلاّم پەلەوەر و ئاژەلی سەر کەشتیەکە بە زیندووی ماونەتەوە ؟

ئایا ڕاستە لە زۆرینەی حاڵەتەکانیا هیچ پاشماوە و ئاسەوارێك بە جێ نامێنێ ؟

دەبێ هۆکارەکانی ئەو ڕووداوانە چیبن ؟ ئاسا سروشتین ، یان مرۆیین ، یان هەردوکیان ؟ دەبێت پەیوەندی چ بێت لە نیوان ناوی ناوچەکە و ئەو توێژاڵکە هەوایەی کە بەسەر ناوی ناوچەکەوەیە ؟

بەگشتی لە کۆی وەڵامەکان دەگوترێت ، بەڵێ ڕاستە ژمارەیەکی زۆر کەشتی و پاپۆڕ و فڕۆکە لەم ناوچانەدا دیار نامێنن ، ڕەنگە هەندێکی زۆر کەمیان دوای ماوەیەك پاشماوە و ئاسەوارێکیان لێ بەدەر نەکەوتوێتەوە ، بەڵێ ڕاستە زۆرینەیان هیچ پاشماوە و ئاسەوارێکیان لێ بەدەرنەکەوتبێتەوە ، بەلێ ڕاستە زۆرینەی حاڵەتەکانی دیارنەمان لە بارودۆخێکی ئاڵۆز و نادیاردا بوون بە بەڵگەی پەیوەندی کورت و نارێگ و پچڕ پچڕەکانی ئەو پاپۆڕ و فڕۆکانە و بنکە بارەگاکانی خۆیان ، دیاردەکانی دیارنەمانی فڕۆکەو کەشتی دیاردەیەکی ڕاست و دروستن ، کەس ناتوانێ نکۆڵیان لێبکات ، پاپۆڕ و کەشتی و فڕۆکە ناویان هەیە و لە کۆمپانیا و دەزگا تایبەتیەکان تۆمار کراون ، ئەوانەی ئەم ساڵانەی دوایی لە کۆمپانیاکان دڵنیا بوون – شرکات التامین – تۆمارکراون و قەرەبوویان بۆ وەرگیراوە ، ئەو مرۆڤانەی لەم ناوچانەدا بزربوون و بێسەر و شوێنبوون ،کەسانی خاوەن ناسنامەو و ناسراوبوون ، هەندێکیان لەناو سوپا و هەندێکیان لە کۆمپانیا بازرگانی و گەشتیارەکاندا کاریان کردووە ، ئەوەی کارێکی نەشیا و نەگوونجاوە کە ناوی کۆمەڵە کەسێك بهێنرێت و زیندووین ، مەگەر ئەم کارە ناوزڕانو بەرپرسێتی یاسایی کۆمەلایەتی لێناکەوێتەوە؟ بەلام بۆ بابەتی بارودۆخی دیارنەمان و بزربوونەکە ، ڕەنگە لە هەندێ حاڵەتدا بۆ ووروژاندنی هەستی خەڵکی یان بۆ گەورەکردن و زێدەڕەوی ، یان هەر نوسەر کتێب و بلاوەکانی بۆ سوودی ئابووری یان بابەتەکەیان وەرگرتبێت – بۆ نموونە کە کتێبەکەی چالزبیرلتز- بێناسەوار- لەسەر سێگۆشەی بەرمۆدا

لە ئەمریکا بڵاوبووەوە ، هەر بەتەنها یەکەمین چاپی پێنج ملیۆن دانەی لێفرۆشرا، بەلام لە هەموو حاڵەتێکدا و بارودۆخی دیارنەمانەکان هەر چۆنێك بێت ، نیشانەی پرسیار و تێڕامان و ئاڕادەیەك نامۆی پێوە دیارە ، وەلامی ئەو کۆمەڵە پرسیارەی کە پێشترکران، بە چەند ڕستە و دەستەواژەیەك ، یان بە بەڵی و بە نەخێر ، بەلایەنی کەمەوە لەم سەردەم و ڕۆژگارەدا و هەروا بە ئاسانی نادرێتەوە ، چونکە هەندێ لە زانایان و پسپۆڕان رایان وایە ئەو بڕە زانست و زانیارییەی ئێستا لە بەردەستدایە و ئەو یاسا و ڕێساو پێوەر و هاوکێشە سروشتیانەی ئەم سەردەمەی بەس نیە ، بۆ وەلام دانەوەی ڕوودانی ئەم جۆرە دیاردانە ، لەم بارەیەوەزانا ( ئیسحاق ئەسمۆف ) دەڵێت ( ... هیچ شتێك نیە شیاوی ئەوە بێت لێکدانەوەی بۆ نەکرێت ، بەلام گرنگ ئەوەیە ئەو زانیاریانەمان لەبەردەستدا بن ، کە پێویستن بۆ لێکدانەوەی ئەو دیاردانە[11] ).

زانایان و پسپۆڕان و توێژەرەوانی ئەم سەردەمە وا ڕاهاتوون ، یان وا ڕاهێنراون بە تەنها ئەو ڕووداو دیاردانە بەڕاست و دروست پەسەند بزانن کە دەتوانن بەو بڕە زانستەی بەردەستیان لێکیان بدەنەوە ، گەر بەو بڕە ئەم کارەیان بۆ کرا و سەلماندیان ئەوا ئەو دیاردەیە بە ڕاست و دروست دەزانن ، گەرنا ئەو دیاردەیە هەشبێت یان ڕوویدات ،ئەوا ناڕاست و نادروستە و دەچێتە خانەی ئەفسانە و خەیاڵ و جادوو چیرۆکی زانستیەوە !!

لەم ڕووەوە و تەیەکی بەناوبانگ هەیە دەڵێت ( ئەو دیاردەیەی نەتوانێت تێیبگەیت پشتگوێ ی بخە ) لێرە جێگەی خۆیەی و ڕەوایە پرسیارێك بکرێت ئەویش ئەم شتیە ، ئایا ئەو بڕە زانست و زانیارییەی ئێستا لەبەردەستدایە ئەو ئامێر و کەرەسە و دەزگاو داهێنراوە تەکنۆلۆژییانە ، دوابەخششی مرۆڤن ، بۆ شارستانیەتەکەی ؟ دواچۆڕەی زانست و زانیاریی زەریا گەورەکەی زانستە

؟ ئایا ئەو برِە وەڵامی تەواوی هەموو دیاردە سروشتی و مرۆییەکانی سەرگۆی زەوی و گەردوونە ؟

لەم بارەیەوە د.عادل موسی الناحس دەڵێت ( دکتاتۆریتی زانستی هاوچەرخ گەورەترین پرۆسەی مێشکشتنەوەی بۆ مرۆڤ لە مێژوودا ئەنجامداوە، زاناو توێژەرەوەکانی هەمیشە ئەو دیاردانە لە مێشکی خۆیان دەردەکەن کە بە پێوەری زانستی نوێ لێکنادرێتەوە و ناسەلمێنرێن ، ئەوسا دەیانخەنە پاڵ ئەفسانە و خەیاڵ [2] )دواتر عادل لەسەر باسەکەی دەڕوات و دەڵێت ( زاناکانی ئەم سەردەمە ئەویان لە بیر چۆتەوە ، یان لەبیر خۆیان بردۆتەوە ، کە زاناکانی سەدەکانی ناوەڕاستیش ، تەنانەت ئەوانەی سەدەی نۆزدەیەمیش هەروەك ئەمانەیان بەسەر هاتووە [3] ).

پێش سەلماندنی گۆیێتی ( خرِێتی ) زەوی گەر باسێکی لەو بابەتە بکرایە ئەوا بە تاوان دەژمێردرا ، لەسەدەی نۆزدەیەمدا ئەندامێکی ئەکادیمیای زانستی فەرەنسایی گوتبووی ( فرِین لە هەوادا بەدی نایەت چونکە مرۆڤ لە هەوا قورسترە [4] ئەوە بوو بەدیشهات ، لافوازێ ، کە زانایەکی فەرنسایی بەناوبانگبوو گوتبووی ( کەوتنە خوارەوەی ئەیزەکەکان لە ئاسمانەوە نییە چونکە ئاسمان بەردی تێدا نیە [5] )

لە مێژووی ژیانی مرۆڤایەتیدا سەدان و هەزاران دیاردە هەبوون کە لەو کات و سەردەمانەدا مرۆڤ هۆکاری زانستیەکانی پێلکێەدەدرانەوە ، پەنایدەبردە بەر ئەفسانە و خەیاڵ و ئەندێشە ، پاش ئەوەی لە پێشکەوتن و زانست قۆناغێکی برِیوە ئەو ئەفسانە و خەیالأنە بوونەتە ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگر و دروست .

ئەوەندەی پەیوەندیان بە هۆکاری دیاردەکانی سێگۆشەی بەرمۆداوەهەیە تا ئەمرۆش مایەی گفتو گۆ و لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زانستین .

ئەو کەسانەی دیاردەکانی سێگۆشەی بەرمدا بۆتە جێگەی بایەخپێدان و سەرنجیان دابەشبوون بەسەر دووکۆمەڵدا ڕاوبۆچوونی بەڕاست و دروستی دەزانن ، بەسەیر و سەرسوڕهێنەرو نامۆی ناودەبەن .هەوڵ دەدەن لێکدانەوەکانیان ئامانجەکەیان پێکابێ ، یان ئەوە گرنگ نیە بەلام لەم کۆمەڵەوە دروستی ڕووداوەکان و نامۆی و نادیاری و ئالۆزی دیاردەکانە ، کۆمەڵەی دووەم ئەوانە کە دادەنێن بەڕوودانی دیاردەکانە ، بەلام لە بارودۆخی ڕوودانە دیاردەکاندا نادیاری و ئالۆزی نابینن ، بەڵکو ڕووداوی ئاسای و ڕۆژانەن .

ئێمەش وەکو شێوازێکی دروستی میتۆدی لێکۆڵینەوە و ئەمانەتێکی زانستی هەوڵدەدەین کە هەردوو کۆمەڵە ڕاوبۆچوونەکانیان بخەینە ڕووهەڵەو ڕاو بۆچوونی خۆشمان دەخەینە روو ، کە مەرج نییە لەگەڵ ڕاوبۆچوونەکانی ژمارەیەك لە خوێنەراندا یەکبگرێتەوە .

## باسی یەکەم /
## ڕای ئەوانەی پشتگیری لە دیاردەکە دەکەن و هەوڵدەدەن لێکدانەوەی زانستی بۆ بکەن :

لە ئەنجامی باسەکانی پێشوودا ، ئەوە ڕوونکرایەوە کە ژمارەیەکی زۆر کەشتی و پاپۆڕ و فڕۆکە لەسەر ئاو لە هەوای ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا دیارنامێنن ، دیارنەمانەکان ڕووداوی ڕاستەقینەن ، گومان نیین لە ڕوودانیان ، جا نامۆ و سەرسوڕهێنبن ، یان ئاسایی ، سەرەتا و پێش گەڕان بە دوای هۆکارەکاندا زانا و لێکۆڵەرەوەکان ، کەوتنەگەڕان و سنوری ئەو ناوچانەیان دیاری کرد کە زۆر ترین ڕووداو تیایاندا ڕوودەدات، وردەکارییەکانیان کۆکردنەوە ، ئەگەر وگریمان و بیردوزیان لەسەر داناو یەکێك لە لێکۆڵینەوە گرنگەکان ئەوەبوو کە ئاژانسی ناسای ئەمریکای ئەنجامیدا ، زانای بەناوبانگی ئەمریکایی ( ئیڤان ساندرسن ) نێردرا بۆ ناوچەکە ، ساندرسن خۆی و تیمەکەی لەسەر کەشتیەکەبوون ، کۆزۆ قایم و توند و تۆڵ دروست کرابوو ، زۆر بە زەحمەت ژێر ئاو ئەکەوت ژمارەیەکی زۆر ئامێر و دەزگای گەیاندن و پەیوەندی فریاکەوتنی تێدابوون ، هۆی ئەوانەی هەرکات بویسترایە ئەنجام و زانیاییە نوێیەکان دەدران بە مانگە دەستکردەکان و لەوێشەوە دەرەوانە دەکران بۆ وێسگەی ووشکانی لە وولایەکگرتووەکانی ئەمریکا ، لێکۆڵنیەوەکانی ساندرەسن نزیکەی ( ٦ )مانگیان خایاند ، ئەنجامی سەیر و سەرسوڕهێنیان لێبەدەست هات ، لەوانەیە هەندێ کات ئاستی ئاوی زەریاکە لەو ناوچەیەدا هەتا بەرزای ( ٢٥م ) بەرزدەبووەوە ، خێرایی شەپۆلەکان دەگەیشتە ( ٢٥م/چرکە ) بێنەوەی هیچ هۆکارێکی دیاری کراو و زانراو هەبێت لە هەندێ بارودۆخدا پلەیگەرمی ئاوی هەندێك جێگە لەو ناوچەیەدا ئەوەندە بەرز دەبووەوە کە ئاوەکە دەکولا ( ٦ ) ئەمە ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکی زانستیە و پسپۆڕانە

کردویانــە خــەرجی و ئــەرك و کــاتێکی زۆریــان خایانــدووە ، دەزگــا و ئامێریپێشکەوتووی تێدا بەکارهێنراون ، تۆماکراو بلاَو کراوەتەوە ، باس لە دوو دیاردەی زۆر سەیر و نامۆ دەکات ، بەرزبوونەوەی ئاوەکـە و بەرزبوونــەوەی پلــەی گەرمییەکــەی بــەو ڕادە زۆرە ، ئــەوە ســەلمێنرا، بەلاَم هۆکارەکــەی نەسەلمێنرا !؟

هــەروەها زانــا ڕووســیەکانیش جــەختیان لەســەر ئــەوە کردووەکــە مانگەدەستکردەکەیان – ئەوانەی تیابەتین بە بەواری زانستی – دیارمەدەیەکی نامۆیــان لەســەر سێگۆشــەی بــەرمۆدا تۆمــار کردووەکــە ژمــارەی لــەرەکانی ( زبزبات ) ئەو ناوچەیە ( ٦ )هێرتزە، کە خۆی لە باری ئاساییدا ( ٧ ) هێرتــزە بەلاَم هیچ ڕوونکردنەوەیەکیان لەو بارەیوە نەداوە [٧] .

هەتا ئێستاش بەبەردەوامی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لەسەر ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا دەکرێت زۆرینەی بلاَوکراوەتەوە ، ڕەنگــە هەندێکیــشی بــۆ مەبەســتی ئەمنی و موخابەراتی بلاَونەکرێتەوە ، لێرەدا پێویستە جــەخت لەســەر ئــەوە بکەین ئەوانەش کە پاڵپشتی لەسەیر ی و نامۆیی ئــەم ڕودانــەوەی سێگۆشــەی بەرمۆدا دەکەن و بەدوای هۆکاری ڕووداوەکاندا دەچن و دەیانــەوێت بــە بەڵگــە زانــست حاشــا هــەڵگر بیانــسەڵمێنن ، ئــەو کەســانەش ئــەو هۆکارانــەی دەیا نخوێنێتەوە بە بیردۆز و گریمانی دەزانــن ، ئەمــە جگــە لــەوەی کــە لــە ناوخۆشیاندا کۆك و تــەبا نــین ، بەبەڵگــە ئــەو ژمــارە زۆرە هۆکارەکــان کــە دەهێنرێتەوە بــۆ ڕودانــی ئــەو دیاردانــەی ، هــەوەها ئــەو هۆکارانــە هــەموو ڕووداوەکانیان پێلێکنادرێنەوە ، ڕەنگــە هۆکارێــك دیاردەیــەك یــان دوو یــان زیاتری پێی لێکبدرێتەوە:

بەڵام بۆ هەر هەموو حاڵەتەکان کە زۆرن و لێکجیاوازان ناشێن و ناگونجێن ، وا لە خوارەو هۆکارەکان دەکەین بۆ دووکۆمەڵەی سەرەکی ، ئەوانیش هۆکارە سروشتی و هۆکارە مرۆڤایەتیەکان کە لە ناوخۆشیاندا دەبن بە چەند بەشێکەوە.

یەکەم / هۆکارە سروشتیەکان

بەگوێرەی ڕاو بۆچوونەکانی لایەنگرانی ئەم بیرۆکەیە ، سروشت لە پشت ئەم ڕووداوانەوەیە ، سروشی ئاوی دەریای سارجۆ و ئەو گۆڕانە فیزیاییانەی کە لەناویدا ڕوودەدەن هۆکار و بەرپرسن لەو دیاردانە ، ئەوانە پێیان وایە هیچ هۆکارێکی مرۆیی لەهەر ئاست و پلە و شێویەکدابێت ، پەیوەندی بەودیاردانەوە نییە ، ئەو گۆڕانە کتو پڕ و لە ناکاوانەی بەسەر کەش و هەوای ناوچەکەدا دێن ، ئەو شە پۆل هەڵچوونانەی کە لە ئاوی دەریای سارجۆدا ڕوودەدەن ، یان ئەو بوورکان و زەمینلەزانەی کە لە بنکی دەریاکەدا ڕوودەدەن ، یان هەر هۆکارێکی تری سروشتی نەزانراو لە پشت ئەو دیاردانەوە بن ، لە خوارەوە لەو باسانەدا کە دواتر دێن هەوڵدەدەین کەمێك بە درێژتر ئەو هۆکارانە بە شێوەیەکی ئاسان و ساکار بۆ زێدە تێگەیشتن بە خاڵ بخەینە ڕوو :

١.شە پۆلی هەلکشان و داکشان – موجات المد و الجزر :

تیمێك لە زانایان وای بۆ دەچن کە لە ئاوی دەریای سارجۆ و هەندێ شوێنی تریشدا شە پۆلی هەڵکێشانی زۆر توند ڕوودەدەن ، کەلە هەندێ بارودۆخدا و لە هەندێ جێگەی ئەم ئاوەی سارجۆدا بە بەرزایی نزیکەی (٦٠) مەتر بەرز دەبنەوە ، ئەو شە پۆلانە کاتی دیاریکراویان بۆ نییە ، پێشبینیان بۆ ناکرێ ، تەنانەت هۆیەکانیشیان بەوردی نازانرێت – گەرچی لە هەندێ سەرچاوەدا بۆ

ڕوودانی زەمینلەرزەی بنکی دەریاکانی دەگێڕنەوە ، لایەنگرانی ئەم بیرۆکەیە دەڵێن ئەو شە پۆلە هەڵکشاوانە ئەوەندە بەهێزن کە نەك هەر کەشتی و پاپۆڕەکان تێکدەشکێنن و ژێرئاویان دەخەن ، بەڵکو لە توانیاندا هەیە بیانکەن بە چەند بەش و پارچەیەکەوە، بەلام دەبێت هەلو مەرج بڕەخسێت بۆ ئەو شکاندن و پارچە پارچە بوونە ، وەك شوێنی پاپۆڕەکە لە ئاست ئاراستەی ئەو شە پۆلە هەڵکشاوانە ، مەودای هێز و خێرای ئەو شە پۆلانە بەرزبوونەوەی لە ناکاوی ئەو شە پۆلانە هەتا بەرزایی ( ٦٠م ) لە توانیایدا هەیە تەنانەت ئەم فرۆکانەش تێکبشکێنێت کەلەو بەرزاییانەدا دەفڕن .

گەر بەروردی بڕوانینە ئەم هۆکارە و بیبیستینەوە بە تێکڕای ڕووداوەکان بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم هۆکارە بەتەنها ناتوانێت هەموو ڕووداوەکانی پیلێکدرێتەوە، بەڵێ ڕاستە شە پۆلی وا گەورە و بەرز و بەهێز هەموو پاپۆڕێك تێکدەشکێن و ژێر ئاوی دەخات بەلام ئاسەوار و پاشماوەی ( بەلەمەکە بە سەرنشینەکانیشەوە ) هەر لێدەکەوێتەوە ، بەلام هەرگیز ئەوەی پیلێکنادرێتەوە ، کە بۆ لە هەندێ حاڵەتدا بەتەنها سەرنشینەکانی پاپۆڕ و کەشتیەکان دیارنامێنن [٨] .

٢- تەوژمی کەنداو : تیار الخليج :

تەوژمێکی ئاوی گەرمە ، لە کەنداوی مەکسیکەوە بەرەو باکووردەکشێت و ، تەوژمێکی زۆر گەورەیە ، بەدەوری نیمچە دورگەی فلۆریدا و پاشان بەرەو باکوور ڕێدەکات ، لەبەر ئەوەی لە بازنە پانییە باشووریەکانەوە ، بەرەو بازنە پانییە باکوورەکان دەڕوات ، واتە لە باشوورەوە بەرەو جەمسەری باکوور دەڕوات بۆیە تەوژمێکی کەشتی و پاپۆڕە دیارنەماوەکان بۆ ئەم هۆکارە دەگەڕێنەوە ، گەر ئەمەمان ڕەچاوکرد ئەم تەوژمە لە ناوچەی بەهاما و

فلۆریدا زۆر چالاکە ، وەك ڕووبارێکی زۆر مەزنی خێرا ، بەلاّم بە تەواوەتی هەموو ڕووداوەکانی پێلێك نادرێتەوە .

٣. تەوژمە هەواییەکان – التیارات الهوائیه :

لەناو ئەتمۆسفێردا دیاردەیەك هەیە پێی دەگوترێت ( ڕاکشان – الشد ) کە تارادەیەك لە شەپۆلە ئاوییە هەلّکشاوەکان دەچێت ، بەلاّم ئەمیان هەوای سەرکەوتووە لەبری ئاو ، ئەم دیاردەیە کار لە ڕێکردن و تەنانەت سەلامەتی فڕۆکەکانیش دەکات ، گەروا ڕێککەوت فڕۆکەکان بەخێراییەکی زۆرەوە بەرەو ڕووی ئەو تەوژمە سەرکەوتووە چوون ، ئەو تەوژمانە ئەوەندە بەهێزن ، فڕۆکەکانیش لەگەلّ خۆیاندا بەرز دەکەنەوە بۆ سەرەوە ، دەشێ هەندێ جار بەهۆی تەوژمی هەوای داچووی بەهێزەوە ، ئەوو فڕۆکانە داببەزن بۆ خوارەوە ، ئا لەم حالّەتەدا فڕۆکە تێکدەشکێت ، وەك ئەوە وایە ، بەخێراییەکی زۆرەوە خۆی دابێت بە دیوارێکی لە بەرد دروست کراو [١٠] .

٤. بیردۆزەکەی ئیڤان ساندرسن :

ئیڤان ساندرسن زانایەکی ئەمریکاییە ، بیردۆزێکی هێنایە کایەوە ، کە دەلّێت زۆر لە ناوچەی ئەو دیاردەیەی تێدا ڕوودەدات دەکەونە . ناوچەیەك کە شوێنی بەیەکگەیشتنی تەوژمە دەریاییە ساردەکان و توژمە دەریاییە گەرمەکانن ، ئەو ناوچانەی کە بەیەکگەیشتنەکانیان تێدا ڕوودەدەن دەبنە ناوچەی گرێ ( منطقة عقدية )لەم گرێیانەدا تەوژمەدەریاییەکانی سەر ڕووی ئاوەکان و تەوژمەکانی ژێر ئاوەکان بە ئاراستەیەکی جیاواز دەڕۆن ، ساندسن وای بۆ دەچێت ئەو جووڵە بەهێزەی ئەو دوو جۆرە تەوژمە ئاراستە جیاوازە ، کە جیاوازیش لە پلەی گەرمیدا دەبێتە مایەی دروست بوونی ( گێژاوێکی موگناتیسی )کاتێك ئەو تەوژمەگەرمانەی بەرەو باکووری خۆیان دەڕۆن و

یەکدەگرن لەگەڵ ئەو تەوژمانەی کەبەرەو باشور دێن یەك دەگرن و ئەو ناوچانەی یەککرتنەکەیان بە یەککەیشتنەکەی تێدا ڕوودەدات ، دیاردەی جوولان و بزوتنەوەی ناویدا پەیدا دەبێت ، تەوژمە دەریییەکانی سەروی ئاوەکان بە ئاڕاستەیەك دەسوڕێنەوە ، جیاواز و پێچەوانەن لەگەڵ سووڕانەوەی تەوژمە دەریاییە ژێرموییەکان ، لەمەوە ئەو گێژەلووکە و خوێندنەوەکەیان هەڵە دەبن ، ساندرسن وای بۆ دەچێت ئەو گێژەلوکە موگناتیسیە ئەوەندە بەهێزە ، ڕەنگە فڕۆکەکان دووربخاتەوە لە ڕێڕەوەکەی خۆیان و تێکیان بشکێنێ ، گەر بەڕێککەوت ئەو فڕۆکانە بەسەر ئەم ناوچە گرێیانەدا تێدەپەڕن [11] .

٥- کایەی موگناتیسی – المجال المغناطیسی :

زانایەك بەناوی ( وێلبێرت سمیس ) بیردۆزێکی داناوە سەربارەت بە دیارنەمان و بێسەر و شووێنبوونی ئەو پاپۆر و فڕۆکانەی ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا ،ئەو بیردۆزەش پەیوەندی هەیە بەکایەی موگناتیسیەوە ، سیمس دەڵێت ، لەوە دەچێت کونێکی لە بەرگەگازەکەدا هەبێت ، لە کوونە لە ئە تمۆسفیردا ئەوەیە کە جیاوازیەك هەیە ، یان دژایەتیەك دروست دەبێت لە نیوان کایەی موگناتیسی تایبەت بە ئەستێرەکان و کایەی موگناتیسیەکەی زەوی، بەهۆی ئەو جیاوازییەوە ، لەو ناوچانەدا هێزی کێشکردن نامێنێ ، بەوەش تەنەکان لەو ناوچانەدا بەسەر ڕووی زەوییەوە بەند نابن ، بەڵکوو بەرز دەبنەوە بۆ سەرەوە ، پاشان بەرەو بۆشایی گەردوون دەڕۆن لەناو ئەو بۆشاییە گەورەیەدا بزر دەبن [12] .

٦. بیردۆزی یەك بواری بەلای ئەنشتاینەوە – نظریة المجال الموحد

ئەنشتاین پێی وابوو کە دەتوانێ بیرکاریانە ئەوە بسەلیمێنێت کە کێشکردن ( الجازبیـــە ) شـێوەیەکە لـــە شـێوەکانی وزە و بـــە پلـــەی یەکـــەم کــارۆ مۆگناتیسیەکەواتە ئەگەری ئەوە هەیــە ودەکـرێ ، کـە کایـەی کـێش کـردن ( المجال الجزبی ) بەرهەم بهرێنرێت ، لە کارلێکی نێوانیان ، بە گوێرەی ئـەم بیردۆزیەو هەیەرکـە لـە بوارەکـانی کـارۆ موگناتیـسی و کێشکردن دووڕووی جیاوازی یەك شتن ( [١٣] ) .

بە جێبەجێکردنی ئەم بیردۆزە جیاوازی نامێنێ لە نێـوان ئـەودوو کایەیـەدا ، توێژینەوەکانی ( ئەسـترد فـارادای ) لەسـەدەی نۆزدەیەمـدا دمریا نخـست کـە تـەزووە کارباییـەکان هەمیـشە بەکایـەی موگناتیـسی دەوردەدراون ، هێـزە موگناتیسییەکانیش ،بە تەزووی کارەبایی

دەورە دەدرێن، بەمەش کایەی کارۆموگناتیسی دۆزرایەوە ، کەواتە دەتوانرێـت کارەبا و موگناتیس بەیەك دیاردە دابنرێن . پەیوەندی نێـوان ئـەم بـیردۆزە و دیاردەکانی ناوچەی سێگۆشـەی بـەرمۆدا لـەوەدا دەردەکـەوێت گـەر بـوارێکی کارۆموگناتیسی بەرهەمیهێنرێت بە دەوری هەر تەنێکدا ، ئەوا ئەو هێـزە لـە توانایدا هەیە ئەو تەنە لە بینراوەوە بگۆڕێ بۆ نەبینراو ، واتــە بـزر بێـت و دیارنەمێنێت ، ئەمەش لە تاقیکردنەوەیەکـدا جێبـەجێکرا کـە ناسـراوە بـە تاقیکردنەوەکەی فلادفیا ( [١٤] ) .

لەبەر گرنگی بابەتەی تاقیکردنەوەکەی فلادفیا و پەیوەندی بە دیاردەکـانی ناوچەی سێگۆشەی بـەرمۆداوە ، جـارێکی تـر لـە بەشـێکی تـردا بـە درێـژی دەگەڕێینەوە سەری )

٧. ڕای هەندێك لە زانایای ڕووس:

گۆڤارێکی زانستی رووسی بەناوی ( بریرودا ) توێژینەویـەکی بلاوکـردەوە کـە دەتوانرێـت تاڕادەیـەکی زۆر ، دیاردەکـانی ناوچـەی سێگۆشـەی بـەرمۆدانی

پێلێکبدرێتەوە ، گۆڤارەکە دەڵێت ... زاناکانی ڕووس بۆیـان دەرکـەوتووە کـە هایدراتی گاز پێکهاتیەکی ڕەقە لـە میـسان و ئـاو پێکهـاتووە ، ئـەم جـۆرە پێکهاتەیە بە چینە سەرووەکانی بەردە نیشتییەکانی چاڵە قووڵـەکانی وەکـو ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆداهەیە ، لەژێر کاریگەری ئەو پلە گەرمی نزمە و ئەو پەستانە زۆرەدا ،تونێکلێك ، یان پوولەکەیەك بە دەوریدا دروست دەبێت ، کـە زۆر گەورە و مەزنە ، ئەستوراییەکەی دەگاتە ( ٣٠٠م ) بەوەش بڕێکـی یـەکجار زۆر گازی تێدا کۆدەبێتەوە ، گە ر ئـەو تونێکلـە یـان ئـەو پوولەکـە گەورەیـە بەهەرە هۆکارێك – ناوەکی بێت ، یان دەرکی – بشکێت یان قڵیش ببـات ئـەوا بڕێکی یەکجار زۆر لەو گازە بـە خێراییـەکی زۆر دەردەپەڕێتـە دەرەوە ، زانـا ڕووسەکان دەڵێن ، حاڵەتێکی لەو جۆرەیان لە دەریاری ( ئوخوتسك ) دیوە کـە گازە دەرپەڕیوەکە بەشێوەی ستوونێك ، یان کۆڵەکەیـەك دەرپەڕیوەتـە دەرەوە هەتا نزیکەی ( ٥٠٠م ) بەرزبۆتـەوە، کـە بڕێکـی زۆر گـازی میـسان و دووانـە ئۆکسیدی کاربۆن و گۆگردی هایدرۆجینی لەگەڵدایە دەرپەڕیوەتە دەرەوە ، ئەم توێژەرەوانە وای بۆ دەچن گەر پا پۆڕێك ، یـان فڕۆکەیـەکی نـزم فڕیـوە لـەو کاتانەدا تووشی ئەو دیاردەیە دەبێت ، ئـەوا کارەسـات ڕوودەدات ، بەلایـەنی کەمەوە ئەو بڕە ئۆکسجینەیان دەستناکەوێت کە بۆ ژیان پێوستە [١٥]

لە کۆتایی باسی ئەم هۆیانەدا بەچاکی دەزانین ئامـاژە بـۆ بابـەتێك بکـەین ئەویش ئەوەیە ئەم هۆکارە سروشتیانەی کە باسـیان لێـوە کـراوە زۆرینـەیان هۆکاری گونجاو لەبارن و پاڵپشت و بەڵگـەی زانـستیان هەیـە ، بـەلام بـە شـێویەکی گـشتی هیـچکام لـەو هۆیانـە وەلامدانەوەیـەکی یەکلاکـەرەوەی تەواونییە بۆ ڕوداوەکانی ناوچەی سێگۆشـەی بـەرمۆدا ، ڕەنگـە خاڵێـك یـان هۆکارێك لەوانەی کە لە پێشەوە ، باسیان لێوە کرا ، وەلامی حاڵـەتێك یـان

چەند حاڵەتێکی پێبدرێتەوە ، بەڵام هۆکارێك نییە لەناو ئەو هەموو هۆکارە سروشتییانەدا وەڵامی هەموو حاڵەتەکانی دیارنەمان بداتەوە ، چونکە حاڵەتەکانی دیارنەمان و ئاسەوار و سەرئەنجامەکانیان ، هەموو جۆرن لە نێوان کەشتی و پاپۆری بێ پاشماوە و ئاسەوار لە ئاودا ، فڕۆکەی بێپاشماوە و ئاسەوار لە هەوادا ، لە هەندێ حاڵەتدا تەنها بێسەر و شوێنبوونی سەرنشینەکانی ناو پاپۆڕ و کەشتیەکە بووە ، هەموو کەردستەو کەلو پەلی ناو پاپۆڕە و کەشتیەکان هەروەکو خۆیانەماونەتەوە .

دووەم/ هۆکارە مرۆییەکان

پێشەکی /

ژمارەیەك لەو زاناو توێژەرەوانەی کە پشتگیری لە دیاردەکانی دیارنەمان و بزربوونی کەشتی و پاپۆڕ و فڕۆکە دەکەن لە ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا ، لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەو دیاردەیە سروشت لێی بەر پرس نییە و ، بەڵکو دیاردەیەکی مرۆییە ، واتە مرۆڤ لێی بەرپرسە ، پاساویشیان بۆ ئەوە زۆرە ، لەوانە جیاوازی و جۆرەکانی حاڵەتەکان ، زۆربوونی ژمارەی ڕووداوەکان لە سەدەی ڕابردوودا ، بارودۆخی حاڵەتەکانی دیارنەمان ، باوەڕیشیان بەوە هەیە کە بوونەوەری زیندووی پێشکەوتوو تر لە مرۆڤە سەرگۆی زەوی لە شوێنێکی تر هەبێت ئەوان ئەم کارانە بکەن ، لەبەر چەند هۆکارێك کە لە باسێکی تردا دەگەڕێینەوە سەر باسی - .

لێرە بەچاکی دەزانم پێش چوونە ناو باسی هۆکارە مرۆییەکان چەند خاڵێك ڕوون بکینەوە کە پەیوەندیدارن / بە باسەکەوە دەبنە دەروازەش بۆ چوونە ناو باسەکەو ئاسانکارییشە بۆ زێدە تێگەیشتنی باسەکە :

١. لەم باسەدا مەبەست لە مرۆڤ ، مرۆڤی سەرگۆی زەوی و ئەوانەش بە شێوە ئەو بچن ، ئەوە بوونەوەر و زیندەوەرانەی تریش دەگرێتەوە کە ڕەنگە لە شێوە

و ڕووخساردا لە مرۆڤی سەرگۆی زەوی نەچن ، وەك ئەوانەی تەنە فڕیودکـان ، کە کەسانێکی زۆر گەواهیی بینینیانی داوە ، ئەوانە لەبەر ئـەوەی بوونـەوەری زیندوون خاوەنی ژیری و هۆش و شارستانێتی پێشکەوتوون ، بگـرە بـە چـەند قۆناغێك لە پێش ئـەو شارسـتانیەی سـەر ئـەم هەسـارەیەی خۆمانـەوەبن ، بۆیەلێرە بە مـرۆڤ ناویاندەبـەین گەرچـی لـە شـێوە و ڕوخـسار و پێکهاتـە جەستەییدا دەقاو دەقیش لە مرۆڤی سەرگۆی زەوی ناچن .

٢. ئەو فاکتەرانەی یارمەتی سەرهەڵدانەوە و بەردەوامی ژیانیان داوە لەسـەر گۆی زەوی بە کوورتی دووفاکتەرن ، یەکەمیان شوێنی زەوی بـە گـوێرەی دووری لەخۆرەوە ، کە دوای عەتار و زوهرە بە پلەی سێیەم دێت ، ئـەم شـوێنەی زەوی کە نەزۆر دورە لـە خـۆرەوە ئـەم شـوێنە وای کـردووە هەسـارەی زەوی بڕێکـی مامناوەندی تیشکی خۆری پێبگاتێ بە خۆگونجانـدن و ڕاهاتنـەوە لـە ئاسـت پێویستیەکانی مـرۆڤ و تیـشکەوە بەرهـەم دێـت بڕێکـی مامناوەندیـە ، نـە ئەوەندە بەرزە ، وەکو ئەوەی عەتارد ، کە پلەی گەرمی ئەو ڕووەی بـە خـۆرەوە دەکاتە ( ٤٠٠+س ) نە ئەوەندەش نزمە وەك بلۆتۆ کە پلەی گەرمی دادەبـەزێت بۆ ( -٣٠٠س ) .

فاکتەری دووەمیان بوونی بەرگە ژێوارییـە – الغلاف الحیـاتی – کـە بەرگـە گازەکە و بەرگە ڕەقەکە و بەرگە شلەکە دەگرێتەوە ، بـەو ڕێـژە و پێکهاتـە و ڕووبەرە زانراوەی کە هەیە ، کەواتـە ئـەم بارودۆخـەی ژیـان و بـەردەوامێتی لەسەر گۆی زەوی تەنها بۆ هەسارەی زەوی ڕەخساوە لەناو هەموو هەسـارەکانی ئەم کۆمەڵەی خۆرەی خۆماند ، لە باشـترین حاڵەتـدا گـەر ژیـانیش لـە نـاو هەسارەیەك ، یان پاشکۆیەکی ناو ئەم کۆمەڵە خۆرەی خۆماندا هەبێت ، ئـەوا بە دڵنیاییەوە ژیانی بوونەوەری زیندووی هۆشیار وژیری خـاوەن شارسـتانێتی

نییە ، ئەو گەشتە ئاسمانیانە و مانگە دەست کردانە بەشێکەی زۆری ئەو هەسار و پاشکۆیانەیان داوەتەوە بەر توێژینەوە و لێکۆڵینەوە ، هەتا ئێستاش ئەنجامەکانی ئاماژە بۆ ئەوە دەدەن کە لە ناو هیچ کام لەو هەسارە و پاشکۆیانەی ناو کۆمەڵەی خۆرەکەی خۆماندە- جگە لە زەوی – ژیانی زیرەکانە نییە ، چ جای ئەوەی خاوەن شارستانێتیبن .

٣. ئەو گەردوونەی کە ئێمە مرۆڤی سەر هەسارەی زەوی هێشتا زۆر کەمی لە بارەوە دەزانین لە ملۆنەها مەجەرڕە ( پێکهاتووە.Glaxies )

لە هەر مەجەرڕەیەکدا ژمارەیەکی زۆر ئەستێرە – نجم- هەن کە بە زیاتر لە ( ١٠٠٠ ) ملیۆن ئەستێرە مەزەندە کراون ، ژمارەیەکی زۆری هەسارە و پاشکۆ- الکواکب والتوابع-تەنی گازیان تێدایە ، لەهەر مەجەرڕەیەکدا ژمارەیەکی زۆر ئەستێرە هەن کە زۆر لەم خۆرەی خۆمان گەورە ترن [١٧] ژمارەیەك مەجەرڕەی لەیەك نزیك کۆمەڵە کەجەرڕەیەك پێکدێنن ، بۆ نموونە ئەم مەجەرڕەیەی خۆمان یەکێکە لەو ( ٢٠ ) مەجەرڕەیە لەیەك نزیکە ،کۆمەڵەی خۆرەکەی خۆشمان سەربەو مەجەرڕەیە ، نزیکترین مەجەرڕەلە مەجەرڕەکەی ئێمە ( ١,٥ ) ملیۆن ساڵی تیشك دوورە ، نزیکترین ئەستێرەش لە ئێمەوە ( ٤٢ ) ساڵی تشك دوورە .

( خێرایی تیشك دەگاتە ( ٣٠٠ ) هەزار کم لە یەك چرکەدا [١٨]

کەواتە ئەستێرەی تر کۆمەڵەی خۆری تر و هەسارە و پاشکۆ و تەنی گازی زۆری تر لە گەردووندا هەن . لە ڕووی مەنیقیەوە دەشێت هەسارەی تر هەبێت هەمان بارو دۆخی هەسارەی زەوی هەبێت لە ڕووی شوێن و بەرگەژێوارییەکەیەوە، بە واتایەکی تر دەشێ ژیانی بوونەوەری زیندووی ژیر لەسەر هەسارەیەك ، لە کۆمەڵە خۆرێکی تر لە مەجەرڕەیەکی تردا هەبێت .

ئەم پێشەکیەمان بۆ ئەوە هێنایەوە ، کە ئەگەر لە پشت ڕوداوەکانی سێگۆشەی بەرمۆداوە مرۆڤ ، یان هەر بوونەوەرێکی زیندووی ژێر هەبێت ، دەبێت لە کام شوێنەوە بێن ، بۆ ناو ناو و ئەو توێژاڵکە هەوایەی ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا ؟وە بە چ مەبەستێك دێن ، هۆیەکانی گواستنەوە و هاتوچۆیان چین و چۆنن ؟ چۆن بە چ ڕێگەیەکدا دێن و دەگەڕێنەوە ؟ وا لە خوارەوەی هەوڵ دەدەین کەمێك بە درێژی وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەینەوە ، کە لە هەمان کاتدا دەکاتە ڕاڤەکردن و لێکدانەوەی هۆکار مرۆییەکانی بەر پر لەو ڕووداوانەی ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا :

١. تەنە فڕیوەکان – الاجسام الطائرةU.F.O

ئەو هۆیەی یان ئەو دەزگایەی کە پەیوەندی و هاتو چۆیان لەو جۆرە کارانەدا پێنە نجامدەدرێت بە تەنە فڕیوەکان ، یان کەشتی یەکانی ناسراون ، بە گوێرەی پێناسەکەی یاسای چەکی ئاسمانی Unidentifed Flying Objects کە کورت کراوەی U.F.O بۆشای ، بە

ئەمریکایین (٢-٢٠٠) تەنە فڕیوەکان وا پێناسە دەکات ( هەر شتێك بە ئاسماندا بفڕێت بەڵام بە شێوە و سیما و جووڵە لە فڕۆکە و بۆمب و ڕۆکێت نەچێت ، نەتوانرێت بە وردی دەستنیشان بکرێت ، کە لە تەنێکی شێوە ناسرا و زانراو بچێت [١٩] .

مەسەلەی تەنە فڕیوەکان یەکێکە لەو مەسەلە ئاڵۆز و نامۆ و سەرسوڕهێنەرانە، کە ڕەنگە هەر خۆی بە تەنها لە ڕووداوەکانی ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا ئاڵۆز تربێت ، گەرچی لەم ساڵانەی دواییدا ژمارەیەك دەوڵەت بە ڕەسمی دانیان بەوەدا ناوە کە دیاردەی تەنە فڕیوەکان دیاردەیەکی ڕاستە قینەی پەسەندە ، هەشە هێشتا دروست و پەسەندی نازانێت ، ئەم

تەنە فڕیوانە لە شێوەی جیاجیادا و لە ناوچە جۆرا و جۆرەکانی جیهان لەسەر بەشە ووشکانی و ڕووبەرە ئاوییەکانی سەرگۆی زەوی بینراون ، بە تەنها لە وولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ساڵی ١٩٧٣ دا ( ١٥ ) ملیۆن کەس گەواهیی ئەوەیان داوە کە ئەو تەنە فڕیوانەیان دیوە ، لەناو ئەم ژمارە زۆرەدا ، کەسانی زانا و خاوەن بڕوانامەی بالاّ و سیاسە تمەدار و هونەرمەند و ... هتد دەبینرێن ، لە چاوپێکەوتنێکی وێستگەی دەنگی ئەمریکادا ، لە زانای بەناوبانگ ئەنشتاینیا پرسی کە ئایا باوەڕی بەوە هەیە تەنە فڕیوەکان شتێکی ڕاست بنو بوونیان هەبێت لە وەلاّمدا ووتی .. بەڵی ڕاستە و بوونیان هەیە [٢١] .

باسەکەی ئێمە ئەوە ناخوازێت کە بکەوینە درێژەی باس و لێکۆڵینەوە لەسەر دیاردەی تەنە فڕیوەکان ، بەتەنها ئەو باسانەمان مەبەستن کە پەیوەندی ڕاستە و خۆیان هەیە بەڕووداوەکانی ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆداوە ، ئەوانیش لە کات و شوێنی خۆیاندا ئاماژەیان پێدەدەین .

٢. ئەو شوێنانەی تەنە فڕیوەکانی لێوەدێن :

گەر باوەڕمان هێنا کە مرۆڤ لەو پشتەدیاردەکانی دیارنەمانی کەشتی و پاپۆڕ و فڕۆکەکانی ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆداوەیە ئەو هۆیەش ئەو جووڵە و گوێزانەوەیەی پێدەکرێت تەنە فڕیوەکانە ، ئەو کات پرسیارێکی گرنگ و سەرنجڕاکێش سەرهەڵدەدات ، ئەویش ئەوەیە ئایا ئەو تەنەفڕوانە لە کوێوە دێنە سەر گۆی زەوی ، بە تایبەتی سەرناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا ؟ سەرەتا ئەوانەی باوەڕیان بەوە هەیە کە سەرنیشنانی تەنە فڕیوەکان ئەو کارانە ئەنجام دەدەن ، دەڵێن ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا بە هەواو بە ئاویەوە ، ناوچەیەکی چالاك و پڕجووڵەی تەنە فڕیوەکانە ، یەکێك لەوانەی کە باوەڕی بەوە هەی و داکۆکی لێدەکات زانا ( د.م جیسۆب ) ە کە گەردووناس و

توێژەیەوەیەکی ناسراوە ، هەروەها زانای شارەزا و پسپۆڕ( جۆن سیبنسرە ) کە شارەزایە لە زانستەکانی بۆشاییدا ، زۆر بە ئاشکرا و ڕوونی دان بەوە دادەنێت کە تاکە لێکدانەوەی پەسەند بۆ دیاردەکانی ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا دەگەڕێتەوە بۆ ( هێزێکی دیاریکراو ) کە ئەو پاپۆڕ و فڕۆکانە لەگەڵ خۆیدا دەبات ، لە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانەی لە ماوەی ساڵانێکی دور و درێژ لەسەر بارودۆخەکانی ئەم ناوچەیە کردوونی ، گەیشتۆتە ئەو دەرەئەنجامەی کە دیارنەمانی ئەو پاپۆڕ و فڕۆکانە ، لەو بارودۆخە ئاڵۆز و نادیارەدا ، بەو یاسا و ڕێسا و هاوکێشانە لێکنادرێتەوە کە ئێستا لە بەردەستدان ، کەواتە دەبێت هێزی تر هەبێت ئەو پاپۆڕ و فڕۆکانە لە زەوی دوربخاتەوە ، ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا لەبەر هەر هۆکارێك بێت – کە ڕەنگە هەتا ئێستا نەزانراوبێت –ناوچەیەکی نموونەییە بۆ ڕوودانی ئەو دیاردانە ، ئەم ناوچەیە ژمارەیەکی زۆر لەو تەنە فڕیوانەی تێدا بینراون ، بە تایبەتی لە ناوچەکانی نێوان فلۆریدا و دوورگەکانی باهامادا ، ئەم تەنە فڕیوانە بە ژمارەیەکی زۆر نەك هەر لە ئاسمانی ئەم ناوچەیە بەڵکو لە ژێر ئاوی زەریاکەشدا بینراون ، یان لە ئاوەکەوە دەرچوون بۆ دەرەوە ، یان هاتوونەتە ناوی [٢٢] .

سەبارەت بەوەی کە ئایا ئەم تەنە فڕیوانە چۆن دەتوانن ئەو هەموو قورساییە وەك کەشتی و پاپۆڕ و سەرنشین و بارەکانیان ، یان فڕۆکەی گەورەی ئەفەر هەڵگر ، هەڵبکرن و بیانگوێزنەوە و ئاراستەیانبکەن ، لەم بارەیەوە د.جیسۆب دەڵێت ... ئەو تەنە فڕیوانە توانای ئەوەیان هەیە کە کایەیەکی موگناتیسی زۆر بە هێز و بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دروست بکەن ، ئەو کات دەتوانێت ئەو پاپۆڕ و فڕۆکانە لەو کایەیە نزیکدەبنەوە، کێشیانبکەن ،

بۆلای خۆیان ، لە شوێنێکەی خۆیانەوە دووریابنخەنەوە بۆ شوێنێکی تری نەزانراو [٢٣] .

هەر سەیارەت بەم بابەتە( جۆن سبینسر ) دەڵێت ... ئەو هێزەی کە ئەو پاپۆڕ و فڕۆکانە بۆلای خۆی کێش دەکات ، تەنە فڕیوە بچووکەکانین بەڵکو تەنێکە وەکو کەشتی بۆشایی ، یان هەڵگرێکی ئەو تەنە فڕیوە بچووکانەیە ، کە دەتوانێت نزیکەی ( ١٢ ) لەو تەنە فڕیوە بچووکانە هەڵبگرێت ( ئەمە بە کەشتی دایك ناسراوە ) هەر لەم ڕووەوە سبینسەر دەڵێت .. هێزی بزوێنەری ئەو تەنە فڕیوانە لەرەلەرە بێسیمییەکانی هەوایە ، ئەمەش بەلای سبنسەرەوە هۆیەکی کارایە بۆ پەکخستنی ئەو دەزگایەوە و ئامێر و هۆیەکانی پەیوەندیکردنی ناو پاپۆڕ و فڕۆکەکان، ژمارەیەکی زۆریش لەو تەنە فڕیوە گەورانە لە ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدادا کەوتوون و بینراون ( ٢٤ ) ئەوانەی لایەن گیری ئەوە دەکەن کە تەنە فڕیوەکان بەر پرسن لە دیاردەی دیارنەمان لە ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدادا ، ئەم خاڵانە بۆ بەرگری و بۆ سەلماندنی بۆچوونەکانیان دەهێننەوە :

١. زۆربەی دەرکەوتنی تەنە فڕیوەکان لە ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدادا ، لە ماوەیەکی دیاریکراودا نەبووە و کۆتاییهاتبێت ، بەڵکو بۆ ماوەیەکی درێژ و هەر لە گەشتەکەی کۆلۆمبسەوەیە -١٤٩٢-هەتا ئێستا .

٢. ئەو بارودۆخە نائاساییو نامۆ و ئاڵۆزانەی کە فڕۆکەوان و کەشتیوانەکان لەم ناوچەیەدا بینیویانن ، - بە تایبەتی ئەوانەی کە لە مردن ڕزگاریانبووە - دەیگەڕێنەوە کە پێشتر ئاماژە بۆ هەندێ حاڵەت کرا - وەك لە کارکەوتنی قیبلە نما ، دەزگای بێسیمەکانی سەرچاوەکانی بەرهەمهێنانی کارەبا و .. هتد ، ئەمانە لەو دیاردانە دەچن کە لە ناوچەکانی تری جیهاندا ڕوویانداوە

و بینراون ، کەواتە ئەمانە کۆمەڵێك دیاردەی هاوکاتن لەگەڵ دەرکەوتنی ئەو تەنە فڕیوانەدا و هەموویان لە توانا و چالاکی ئەواندان .

٣.زۆرینەی حاڵەتەکانی دیارنەمانی فڕۆکە و پاپۆڕ ، لەگەڵ بە دەرکەوتنی ئەو تەنە فڕیوانە هاوکاتبوون .

٤. ئەو داوایانەی فریاکەوتن و بەهاناوە هاتن لە فڕۆکەوان و کشتیوانەکانەوە گەیشتوونەتە بنکەکانیان ، داوای سەیر ووشەی نامۆ و وتەی پچڕ پچڕ و ناتەواو، بگرە هەندێك لە وانە ئاماژەی ناڕاستەوخۆیان تێدایە ، کە بە شێوەیەك لە شێوەکان دەریدەخەن فڕێنراون یان هێرشێکی نا ئاساییان کراوەتە سەر [٢٥] .

کەواتە ناچەی سێگۆشەی بەرمۆدا ، وێستگەیەکی گرنگی ئەو تەنە فڕیوانەیە کە بە زۆری سەردانی ئەو ناوچەیە دەدەن ، بابزانین ئەو تەنە فڕیوانە هەر لە خودی گۆی زەویەوە دێن ، جا لە ژێر ئاوی زەریاکانەوەبێت ، یان لە بۆشایی و هەر ڕۆڵی زەوەیەوە بێت ، یان وێستگەیەکی دەمەزرا و هەیە کە دەشێ لە بنکی زەریادا بێت ، یان لەسەر ناوچەی ووشاکانیەکان دامەزرابێت ، لەوێشەوە بێن و بۆ ئەوێش بگەڕێنەوە .

کۆمەڵێکی تر رایان وایە ئەو تەنەفڕیوانە لە جیهانێکی ترەوە دێن کە لە ئێمەوە دوورە ، لە هەسارەیەکی ترەوە دێن کە سەربە کۆمەڵەخۆرەکەی خۆمان نییە ، سەبارەت بەوەی چۆن دەگەن و چەند دوورە لێمانەوە ، ئەوە بابەتەتێکە لێرەدا پێویست نییە باس لێوە بکرێت ، گرنگ بەلای ئێمەوە ئەوەیە ڕوونبکرێتەوە کە ئەو تەنە ئەگەرهاتنیان لە کوێوەیە ، وا ئەوا ئەگەرانە لەم بەشەدا بە کورتی دەیخەینە ڕوو لە بەشێکی ئەم باسەدا بە درێژەی دەگەڕێنەوە سەری :

**لە گۆی زەوییەوە :**

وەك پێشتر باسی لێوەکرا ئەگەری ئەوە هەیە کە ئەو تەنە فڕیوانە هەر لە گۆی زەوییەوە بێن بەم ڕێگا و شێواوانەی خوارەوە:

١. جیهانێکی تر لە ژێر زەویدا :

بیرۆکەی هەبوونی ژیان لە ناو ، یان وەك دەکوترێت لە ژێر زەویدا زۆر کۆنە ، چیرۆك و ئەفسانە کۆنەکانی یۆنانیەکان و میسریە کۆنەکان ئاماژەی زۆریان بۆ ئەم بابەتە تێدایە .

لەم سەردەمەشدا ، لە سەرەتای هەزارەی سێیەمدا ژمارەیەك زانا و توێژەرەوە هەن ، ژمارەیەکی زۆر تریش توێژنەوە و لێکۆڵینەوە هەن لەسەر ئەو بابەتانە ، هەندی لە زانایان وای بۆ دەچن کە ئەو تەنە فڕوانە لە بۆشاییەوە نایەن ، بەڵکو هەر لەناوی زەوییەوە دین، لە ڕێگەی ئەو کون و کەلێن و کەلەبەرانەی کە دیاریکراون ، ئەم بابەتە بۆتە مایەی مشتو مڕی نێوان زانایان بەو ئاستەی بیردۆزی کە خاوەنەکەی زانای ئینگلیزی ( پۆل لۆرەنس ) ە کە مامۆستای زانکۆی ( کامبرج )ە ناوجەرگەی زەوی بەو بوونەرە زیندووانەی ژێری خاوەن شارستانێتی پێشکەوتوو لە ڕووی زانست و تەکنەلۆجیاوە ناوەدانە .هەر بە گوێرەی ئەم بیردۆزە ، زەوی لە هەردوو جەمسەرەکەیەوە ، جەمسەری باشوور و جەمسەری باکوور کراوەیە ، تا ئەو ڕادەیەی هەندێك دەڵێن ژێرهەرەمی خۆفۆی میسریش ڕێگایە بۆ ئەو شارستانیەتە ، لە ڕێگەی ئەو کەلێنانەوە ، تیشکی خۆر دەگاتە ناوی ، لەو ناوچانەی ژێر زەوییەوە ئەو تەنە فڕیوانە دەگەنە سەر زەوی ، ڕەنگە ناوچەی سێگۆشەی بە رمۆدا وێستگەیەکی گرنگبێت بۆ ئەو تەنە فڕیوان [٢٦] .

( لەبەر گرنگیی ئەم بابەت لە بەشەکانی داهاتوودا جارێکی تر دەگەڕێینەوە سەر باسکردنی ).

٢. جیهانی ژێر ئاوی زەریاکان :

بیرۆکەی هەبوونی ژیان لە ژێر ئاودا بیرۆکەیەکی کۆنە ، سەرەتای بیرۆکەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو چەمکەی دەڵێت .. ئەم زەوییەی ئێستا ئێمەی لەسەر ئەژین ، پێش ئێمە مرۆڤی تری لەسەر ژیاوە ، کە شارستانێتی و پێشکەوتنیان بە خۆوە دیوە ، واتە لەسەر ئەم زەویە ژمارەیەك شارستانێتی پێشکەوتنیان بە خۆوە دیوە ، واتە لەسەر ئەم زەوییە ژماریەك شارستانێتیانە هەر لە بناغەدا لە ناو ئاودا ژیابن و هەر لە ناویشدا گەشەیانکردبێ ، یان دانیشتووی ووشکانی سەرگۆی زەوییوون لەبەر هەر هۆیەکبوبێت بە خواستی خۆیانبووبێت یان بە ناچاری چوونەتە ژێر ئاوی زەریاکان و ئەو ناوچانەیان کردوونەتە نیشتمانی خۆیان ، وەك دەزانرێت ( ٧١٪ ) ی گۆی زەوی ئاو داپۆشیوە ، ژمارە و قەبارە و جۆری زیندەوەرانی ناو ئاو گەلێك زۆرتر و گەورەترن لەوانەی سەربەشە ووشکانییەکەی گۆی زەوی ، گەر ئەوەمان ڕەچاو کرد کە لە ژێر زەریاکاندا ژیانی بوونەوەری زیندووی ژیر هەبێت ، دەبێت ئەوەش لە بەرچاو بگرین کە ئەو بوونەوەرە زیرەکانە شوێن و ڕوبەرێکی زۆر گەورە و بەر بلاّویان هەیە کە دەوڵەمەندە بەهەموو جۆرە دەرامەتێك .

هەندێك لە زانایان باوەڕیان وایە ، لە ژێر زەریاکانی ئەم گۆی زەوییەدا شارستانییەك ، یان ژماریەك شارستانی هەبن ، گەشەکردوو و پێشکەوتووربن لەوەی سەر گۆی زەوی ، دانیشتوانی ئەو شارستانییەتەی ژێر ئاو ، ناوبەناو لەبەر هەر هۆکارێکبێت دێنە سەر زەوی —ئاو و وشکانی- هەر بە تەنها لەبەر ئەوەی خاوەنی ئەم شارستانیەتیە توانیویانە ژیانی خۆیان لە ناو ئاودا گەشە پێبدەن ، لەبەر ئەوەی لە ڕووی زانستی و تەکنەلۆژیاوە ، پێش ئێمەی دانیشووی سەر گۆی زەوی کەوتوون ، ڕەنگە یەکێك لەو داهێنراوە تەکنەلۆژیانە ، یان ئەو تەنە فڕیوانە بێت ، کە بە هۆیانەوە ئەو گەشت و

سەردانانە ئەنجامدەدەن لەهەر ناوچەیەکەوە –مەبەست لە ناوچەکانی زەریاکان – بیانەوێت دەردەکەون و کارەکانی خۆیان ئەنجامدەدەن و دەگەڕێنەوە [٢٨] .

ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا وێستگەیەکی گرنگ و بەرچاوی ئەو گەشتانەیە ، گەر ئەوشمان بە بیر خۆ هێنایەوە بیرۆکەی کیشومرە بزربووەکە – کە دواتر دێینەوە سەر باسکردنی – لە زەریای ئەتلەسیدا نزیکە لە ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆداوە ، لەم ڕووەوە زانا ( ئیڤان ساندرسن ) دەڵێت .. سەرچاوەی تەنە فڕیوەکان زەریاکانن و ژمارەیەکی زۆری چالاکی ئەو تەنە فڕیوانە لە ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا بوون ، زۆریش بینراون ، یەکە دەریاکانی ئەمریکا ژمارەیەکی زۆر لەم دیاردانەیان دیون و بەدوایان کەوتوون لە بارەشیانەوە نوسیویانە ، بەلأم زۆرینەیان بە نهێنی ماونەتەوە و بلأونەکراونەتەوە ، ژمارەیەکی کەمیان کەوتوونەتە بەر دیدەی خوێنەران ، ئەویش لەبەر مەزنی ڕوداوەکە بووە ، یەکێك لەو حاڵەتانەی کە لە بارەیەوە نوسراوە و بلأو کراوەتەوە ، حاڵەتێکی چاودێری بە دوورکەوتن کە لە ساڵی ( ١٩٦٣ ) دا ڕوویداوە، لە کاتێکدا کە هێزێکی ئەمریکایی لە مەشقێکی ئاسایدا بووە لە ناو ئاویی زەریای ئەتلەسیدا و لە باشوری ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدادا ، ئەو هێزە دەریاییە چاودێری تەنێکی نەناسراویان کردووە ، کە بە خێرای ١٥٠ گرێ بەناو ئاوەکەدا ڕۆشتووە ، لەسەرتادا پاپۆڕێك چاودێریکردن و بەدوورکەوتنەی کردووە ، دواتر بۆتە ژێر دەریا وەك لە ڕاپۆرتەکەدا هاتووە ، ئەو تەنە نەناسراوە بە هێزێك یان پاڵنەرێك ڕۆشتووە کە نەزانراوە چییە و چۆنە ، چوار ڕۆژ چاودێری ئەو تەنە نەناسراوە کراوە ، توانیویتی تا قووڵای ( ٧١٠م ) ڕۆبچێت ، هەندێ جار خێراییەکەی ئەوەندە زۆر بووە ، کە باوەر

نەدەکرا / دواتر هیچ نەگەیشتۆتە هیچ دەرئە نجامێك [٢٩] .هەر لەم رووەوە ساندرسن ئاماژە بۆ هەندێ ڕا پۆرتی تایبەتی تر دەکات ئەو ڕا پۆرتانە باس لەوە دەکەن کە لەژێر ئاوی زەریاکاندا هەندێ دیاردەی سەیر و نامۆ بینراون ، بۆ نموونە ڕاوچییە ئەسفە نجی کەنارەکانی ئیسپانیا ، باس لەوە دەکەن کە لە ناو ئاوی زەریایئەتڵەسیدا ، گومەزی ڕوونیان بینویوە ، ماسیگرەکانی ئەمریکای لاتینی باس لە بینینی دیاردەی لەو جۆرە دەکەن ، بەتایبەتی لە کاتێکدا کە ئاوە زۆرەکە هێمن و ڕووناکبێت ، ساندرسن وای بۆ دەچێت ئەوان گەر دامەزراوەی سەربازیین ، ئەوا تۆڕێکی خۆ پارێزن بۆ دەستگرتن بەسەر دیاردەی پیسبوونی ئاودا [٣٠] .

ب- لە دەرەوەی گۆی زەوییەوە – لە بۆشاییەوە :

هەندێ لە زانایان ڕایان وایە ئەو تەنە فڕیوانەلە گۆی زەوییەوە نایەن ، بەڵکو لە دەرەوەی گۆی زەوییەوە دێن ، لە هەسارەیەکی ترەو لە مەجەڕەیەکی ترەوە ، کە ئەو هەسارەیە ژیانی بوونەوەری زیندووی ژیری لەسەرە ، خاوەن شارەزایی تەکنەلۆژیای گەلێك پێشکەوتوون ، کەواتە تەنە فڕیوەکان وەك کەشتیی بۆ شای وان و لە دوورەوە دێن ، بەلام شێوە و ڕووخسا و سیمایان بەلای ئێمەوە نامۆیە ، ئەوەی زۆرتر سەیر و نامۆیە بەلای دانیشتوانی سەر گۆی زەویەوە ، خێرایی لە رادەبەدەری ئەو تەنانەیە لەگەڵ خێرایی جووڵەی ئاراستە گۆڕینی بەرەو هەرلایەك خۆی بیەوێت ، ئەو زانایانە داکۆکی لەوە دەکەن کە ئەو تەنە فڕیوانە ئەو بۆشاییەوە دێن و دەگەنە ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا ( د.م جیسۆب )ە لەگەڵ ( جۆن سبینسەر ) .

لێرەدا کۆمەڵێك پرسیار قوتدەبنەوە ، لەوانە ئەو تەنە فڕیوانە لە کوێوە دێن ؟ چۆن و بەو چ ڕێگایەکم دەگەنە سەر گۆی زەوی ؟ چۆن لە گرفتەکانی

کێشکردن ( الجازبیە ) خۆرزگار دەکەن ؟ چ وزەیەك بەکاردەهێنن ؟ بۆ چ مەبەستێك دێنە سەر گۆی زەوی ؟ ..هتد ئەمانە کۆمەڵە پرسیارێکن وەڵامدانەوەیان خەروا ئاسان نییە ، زۆرینەی وەڵامەکانیش بیردۆز ، گریمان و بۆچوونە ، وروژاندنی ، ئەم بابەتە دەرگای گفتوگۆ و مشتومڕی پێدەخرێتە سەر پشت ، بیرۆکەی تری نوێی پێدێتە کایەوە ، هۆش و بیری مرۆڤی پێ وەلاتر دەبێت ، ڕەنگە هەندێ لەو بیردۆز و بۆچوونانە وەڵامی ڕاست و دروستبن بۆ ژمارەیەك لەو پرسیارانە ، بەڵام هێشتا لە خانەی تیۆرییەوە نەچوونەتە خانەی جێبەجێکردن و تاقیکردنەوە ، چونکە ئەم کارانە هێشتا دورن لەتوانای مرۆڤی سەر ئەم گۆی زەوییە ، بەڵام ناچنە خانەی خوارافە و ئەفسانەوە ، پاشە ڕۆژ ئەوە دایندەکات کە لایەن شارراوە و نادیارەکانی ئەو بابەتانە بدۆزینەوە و ببنە ڕوونکردنەوەی دروست و پەسەند .

لە باسەکانی داهاتوودا هەوڵدەدەین ڕاو بۆچوونی هەندێ لە زانایان و پسپۆران بخەینە ڕوو کە ڕەنگە ببنە وەڵامی گونجاو بۆ هەندێ لەو پرسیارانە.

( د. مانسن ڤالنتین ) لە ساڵی ( ١٩٤٥ ) ەوە ، سەرقاڵی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیە لەسەر دیاردەکانی ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا ، بە ئاشکرا و بەروونی داندەنێت بەوەدا کە پەیوەندی هەیە لە نێوان حاڵەتەکانی دیارنەمانی پاپۆڕ و فڕۆکانەدا بە دەرکەوتنی تەنە فڕیوەکان ، لە وەڵامی پرسیارێکدا کە لێیکراوە لە بارەی ئەو سووتەمەنیە ، یان ئەو ووزەیەی کە تەنە فڕیوەکان لە گەشتەکانییاندا بەکاریاندەهێنن ، لەم بارەیەوە ڤالنیتن دەڵێت .. ئەگەر بیردۆز هەیە لەم بارەیەوە ، ناتوانرێت جەخت لەسەر ئەوە بکرێت کە چ جۆرە

وزەیەکـە ، یـەکێك لـەو ئەگەرانـە ئەوەیـە کـە ئـەو تەنـە فڕیوانـە بەرهەمهێنەرێکی تیشکی کاسـودیان هەڵگرتووەلـە چواچـێوەی خـودی تەنـە فڕیوەکەدا ، بەرهەمهێنەرەکە لە توانایدا هەیە ئـەو گـازەی کـە لەبـەردەمی تەنە فڕیوەکـەدا هەیـە بارگاویکـات ، بـەو کـردارەش تەنـە فڕیوەکـان بـە خێراییەکی زۆر بەرەو لای بارگاوییووەکە دەجوڵێ ، شێوە گۆیـەتیی یەکـەی یارمەتی ئەوە دەدا کە بە هەموو لایەکدا و بـە ئاسـانی بجوڵێـت ، هـەروەها هەوایەکی بارگاوی بەدوای خۆیدا بە جێدەهێڵێ ، ڕەنگە ئەمە وەلامێکبێـت بـۆ پەککەوتن و کارکردنی دەزگا و ئامێرە کارەبایی و ئەلکترۆنیەکانی ناو کەشتی و پاپۆڕ و فڕۆکەکان .

یەکێکی تر لە ئەگەرەکان بەکارهێنانی ڕێگـای پاڵنـانی فـشکەدار – الـدفع النفسی- ئەو هێزەی ئەمان بەکاریدەهێنن زۆر زۆرە، ڕەنگە لە خێرایی تیـشك نزیکبێتەوە ، لەوانە ڕەنگە هێزی ناوکە یەکبوون بەکاربهێنن لـە بـڕی هێـزی ناوکە پەرتبوون ،لەبەر ئەوەی ئەم ڕێگایە پێویستی بە ئاو هەیە ، بۆیە ئـەم جۆرە تەنانە لەسەر ڕووبەرە ئاوییەکان زۆرتـردەبینـرێن ، وە ئەگـەری بـواری کارۆموگناتیـسیش هەیـە [٢٦] یـەکێك لـە پرسـیارە هـەرە گـرنگ و سەرنجڕاکێشەرەکان لەم ڕوومەوە ئەوەیە، ئایا ئەو تەنە فڕیوانە چۆن دەتوانن ئەو هەموو ماوە دوور و درێژە ببڕن و بێنـە سـەر گـۆی زەوی و بـشگەڕێنەوە بـۆ شوێنی خۆیان ، گەر ئەوەشمان وەبیر خۆمان هێنایەوە کە نـزیکترین ئەسـتێرە لە ئێمەوە( ٢,٤ ) ساڵی تیشك دوورە ؟ بۆ وەلامی ئەم پرسـیارە سـەرەتا دەبێـت بیر لـەوە بکرێتـەوە ، کـە دەبێـت ڕێـسا و یاسـای فیزیـایی تـر هـەبن ئـە دیاردەیەیان پێلێکبدرێتەوە ، نەك ئەوانـەی کـە ئێـستا لەبـەر دەسـت دان و ئێمەی مرۆڤی سەر گۆی زەوی پێیان ئاشـناین ، زانـای بـەناو بـانگ ( ویلـەر )

یەکێکە لەو زانانەی لە داهێنانی بۆمبی هایدرۆجیندا بەشداری کردووە ، یەکێکە لەوانەی زۆر بە ووردی لە بیردۆزەکەی ئەنشتاین کۆڵیوەتەوە ، ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانەی بڵاوکردۆتەوە ، کە زۆر سەرنج ڕاکێشە .( ویلەر ) گەیشتۆتە ئەوەی کە دیاردەی بۆشاییە سەرووەکە ( الفضاء العلوی ) یان گەردوونە شاراوەکە ( الکون الخفيی ) یە ئەو فەزایەی ویلەر باسی لێوە دەکات هێنایە بەراو و تێگەیشتنی زۆر گرانە ، ئەو زانایەی دەڵێت ، فەزا سەرووکە ناوەندێکە ، چوونە ناو و هاتنە دەرەوە لێی لە هەموو لایەکی بۆشاییەکانی تری نێوان مەجەڕە و ئەستێرەکانەوە دەکرێت ، تەنانەت لە نزیک لێواری کۆمەڵە خۆرەکەی خۆشمانەوە ، ویلە کەباس لە شێوە و ڕاستەقینەکەی گەردوون دەکات دەڵێت ... وەك ئەڵقەی بازنە بە یەکدا چو وایە ، هەموو مەجەڕە و ئەستێرە بینراوەکان کەوتوونەتە بەشە چەماوەکەی ئەو گەردوونەوە ، بۆشاییە سەرووەکە کەوتۆتە ئەو کەلێنەی کە کەوتۆتە ناوەڕاستی ئەڵقە کراوەکە ، کاتێك ڕووناکی ، یان گەشتێکی ئاسایی بەڕێگای ئاساییە زانراوەکەدا دەڕوات ، یانباشتر بڵێین بەرەو چەماوەکەی بازنەکەیدا بڕوات ماوەیەکی دوور و درێژی دەوێت ، ئەوەش بە هۆی مەزنی قەبارەی گەردوونەوەیە ، بەڵام گەر ئەم ڕووناکیە ، یان ئەو گەشتە لە ڕێگای کەلێنە ناوەکییەکەوە ئەونجامبدرێت کەلەوێدا بۆ شاییە سەرووکە ، یان گەردوونە شاراوەکە هەیە ئەوسا گەشتەکە کات ناخایەنێت. لێرە هەموو یاسا فیزیاییە زانراو باوەکان دەگۆڕین [٢٢] .

نیشانە و خەسڵەتی ئەو بۆشاییە سەرووە هێشتا روون و ئاشکرا نییە ، بەڵام بەلای ویلەرەوە هەر بیردۆزێکی گەردوونی ئەو بۆشاییە لە خۆناگرێت ئەنجامی سەرکەوتنە .

لێرە وە بابەتێکی تر سەرهەڵدەدات ، ئەویش ئەو پەیوەندیەیە لە نێوان ئەم بیرۆکەکەی ( ئەنشتاین ) دا کە باس لە فەزای زەمانی دووریدایە – الفضاء زمانی ذو الابعاء الاربعة

لەو ڕووەوە ویلەر بیری بۆ ئەوە دەچێت کە گوزەرگەیەك هەبێت لە کو کەلێن – ثقوب-بچێت وەك ئەوەی لە کەلێنە ڕەش و کەلێنە سپیەکاندا دەبینرێت ، بەلاّم زۆر بە بچووکی و وردتر ، ئەو گوزەرگایانە دەبنە دەروازە بۆ چوونە ژورەوە و هاتنە دەرەوە لەو بۆشاییەی سەرەوەیە ، بۆ ئەم مەبەستە دەتوانرێت کەشتی ئاسمانیی تایبەت دروستبکرێت لەو کوونانەوە تێپەڕببێت ، دوای ئەوە لە گوزەرگەیەکی ترەوە تێپەر دەبێت و دەبێتە بینراوە ، لە ویلەریان پرسی مەبەست و ئامانج چییە لە گەشتێی ناو بە خەرج و مەترسیداردا ، لە وەلاّمدا ووتی .. بەئە نجامدانی ئەم گەشتە کێشەیەکی لە مێژینەی زۆر گرنگ چارەسەر دەکرێت ئەویش ڕۆشتنە بە خێرایی زۆرتر لە خێرای تیشك چونکە لەناو بۆشاییە سەرسەرووەکەدا کات نییە ، لە هەربەشێکی ئەو فەزایەوە ئەو گەشتە سەروەکەدا کات نییە ، لە هەر بەشێکی ئەو مەنتقیەیەوە پەسەندە ، چونکە ئەو گەشتیارە دەچێتە ناو بۆشاییە سەرووکە ، کە لێی دەردەچێ کات لە دوای خۆیەوە بە جێدەهێلێ ، لەم ناوەندەدا هەر چیەك ڕوودەدات هەنووکەییە ، ڕابووردوو داهاتوو نییە ، هەرچیەك هەیە هەر لە ئێستادایە[٢٢]

دوای ئەم ڕوونکردنەوە کورتە لەسەر بۆشاییە سەرووەکە ، ئایا بۆشاییە سەرووکە ئە نجام بدرێت و هیچکاتێکیش ناخایەنێت ؟ ئایا ئەگەر ئەوە نییە کە ئەو تەنە فڕیوانە لە هەسارەیەکی ترەوە لە دەرەوەی کۆمەڵە خۆرەکەی خۆمانەوە بێن ، بەلاّم لە ڕێگای بۆشاییە سەرووەکەوە بێت ؟ بەڵێ ئەو ئەگەرە هەیە گەر بۆشاییە سەرووکە بەو خەسڵەت و نیشانانە بێت .

لە کۆتای ئەم بابەتە بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی بیرۆکەی( گەشتی بکات ) ئەم نموونەیە دەهێنێتەوە :

گەر بمانەوێت گەشتێك بۆ بۆشاییە سەرووەکەدا ئە نجامدەین بێنەوەی کات بخایەنێت ، بیر لەم وێنەیە دەکەینەوە ، پەڕە کاغەزێك بهێنە ، لەبەشی سەرەوەی پەڕە کاغەزەکە نیشانیەك ، یان خاڵێك دابنێ ، گریمان ئەوخاڵەلە بری هەسارەی زەوییەکەی خۆمانە ، وە لە بەشی خوارەوەی پەڕە کاغەزەکە خاڵێکی تر دیاری بکە ئەویش لە بڕی هەر خاڵێگ یان هەر هەسارەیەك لە بۆشاییدا ، گریمان ئەو خاڵە ( ٥ ) ساڵی تیشك دووربلێت لە زەوییەوە ، گەر لەسەر ئەوە ڕووتەختەوە تیشکێکی بۆ نێردرا ، ئەوا بێگومان ( ٥ ) ساڵی تیشکی دەوێت تا دەگاتە ئەو خاڵە لە بۆ شاییدا ، بەلام گەر پەڕە کاغەزەکەت بۆ نوشتانەوە بۆ دواوە ،تا ئەو ئاستەی دووخاڵەکە لەیەك دەدەن ، بەو ڕێگاکە زۆر کورتکردەوە ، گەر پەڕە کاغەزەکەت کونکرد لە ئاستی شوێنی هەردوونشانەکەوە ، ئەوسا دەبێتە گوزەرگەیەك ، یان کونیلەیەك کەهیچ کاتێك ناوێت بۆ لێوەی تێپەڕبوونی [٣٤].

٣. گەر باوەڕمان بەوە هێنا ئەو تەنە فڕیوانە ، کەشتی بۆشایین و لە دەرەوەی گۆی زەوییەوەدێت ، جێگەی خۆیەتی ئەو پرسیارەش بکرێت .. بۆچی دێن بۆ سەر گۆی زەوی ؟ بۆ ئەو کەشتانە ناو بەناو هەمیشە نین ؟ بۆچی هەندێ ناوچەی تایبەتی دەبنە شوێنی سەرەکی و و هەندێك ناوچەی تر ؟USA گرنگ بۆ ئەو سەردانانە ؟ وەك ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا و دەریای شەیتان و باکوری خۆرهەلاتی

سەرەتا پێویستە ئەوە بگوترێت کە ئەو سەرنشینانەی ناو ئەو تەنە فڕیوانە هیچ پەیامێکی ڕاستە و خۆیان نەداوە بە گوێی دانیشتوانی ئەو ناوچانەی کە سەریانلێداون ، بەلام مرۆڤ خۆی دەتوانێ لە ڕێگای ئەو ئاسەوارو

پاشماوانەیکە بە جێیاندەهێڵن و بەهۆی شیکردنەوە و پێکە گرێدانی ئەو دەرئە نجام و دیاردە و دەرکەوتنانەی تەنەفڕیوەکان .

زۆرینەی ئەو کەسانەی کە ئەو تەنە فڕیوانەیان دیوە ، جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە سەرنشینانی ئەو تەنانە ، مەبەستیان ئازاردانی خەڵکی نییە ، یان کاری تێکدەر و دوژمنکاری و شەڕەنگێزی ناکەن ، لە حاڵەتی زۆر کەم و دەگمەندا نەبێت ، کە کەسانێك لەسەرنشینانی ئەو تەنانە تووشی زیان هاتوون [٢٥].

( سێر مارتن ) ، ئەو زانایەی کە خەلاتی نۆبلی وەرگرتووە لە یەکێتی گەردووناسی جیهانیدا ، هانی مرۆڤ دەدات کە پەیامی ڕادیۆی بۆ شارستانێتی نەنێرن ، نەباد یەکێکیان نێردراوی سزادەرانەی بۆ بنێرێتەو ، ئێمە نازانین دانیشتوانی دوونیاکەی تر چۆن بیردەکەنەوە ، بەلاّم ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە شەڕ و وێرانکاری ڕووی دواکەوتووی شارستانین ، جا ئەگەر ئەو شارستانێتیانە پێشکەوتووبن ، ئامانجیان هەردەم پێشکەوتن و خۆشگوزەرانیە [٢٦] .

کەواتە پێناچێت – بەلایەنی کەمەوە لەم قۆناغەدا – مەبەستیان داگیرکردن و کوشتن و ئازاردانی دانیشتوانی سەر گۆی زەوی بێت ، لێرەدا بە چاکی دەزانین ڕای زانا ( د.رتلیچ ) بخەینە روو ، ئەم زانایە سەرۆکی بەشی فیزیای زانکۆی ( مێزۆری )یە ..دەڵێت ... خۆی و ( ٥٠٠ ) کەس لە یاریدەدەرەکانی ماوەی ( ٢٠٠٠ ) سەعات کاریان کردووە لێکۆڵینەوەکانی لەسەر بەرگە گازەکەی سەر ( ٣ ) شاری ئەمریکا و ئەوانیش شاری ( کیپ جیرادۆ ، پیدمۆنت ، فارمنگتن ) ، ئەمان ( ١٧٣ ) حاڵەتی تەنە فڕیوەکانیان دیون ، لە ١٦ حاڵەتدا ئەو تەنە فڕیوانە ئاگایان لە جووڵەی و دەنگ و تەنانەت ئامازەیان بێسیمیەکانیشبووە

،د . رتلیج دەڵێت ... لەم حاڵەتەدا ئێمە وامان هەست کردووە کە مامەڵە لەگەڵ بوونەوەری زۆر زیرەکدا دەکەن بۆ نموونە حاڵەتێکی کارکرد نمان ، جێگەی کارکردنی تیمەکەمان گۆڕی بۆ ماوەی ( ١٠ ) میل بەرەو خۆرئاوا دورکەوتینەوە ، ئەو تەنەش کە ئێمە چاودێریمان دەکرد ناراستەی کەی خۆی گۆڕی و بە دەورماندا دەسوڕایەوە ، شوێنەکەی خۆی والێکردن هەتا نەیەتە ئەو مەوجایەی کە ئێمە مەبەستمان بوو ( ٣٧ ) ئەمە رای پسپۆڕێکی فیزیاییە لەم بارەیەوە .کەواتە بە شێوەیەکی گشتی سەرنشینەکانی ئەو تەنە فڕیوانە کەسانێکی زیرەك و هۆشیار و بەئاگان ، بۆ مەبەستی تایبەتی دیاریکراو ئەو گەشتانە ئەنجام دەدەن ، زۆر هەوڵدەدەن مرۆڤی سەرگۆی زەوی لە مەبەستەکانیان تێنەگەن ، لەبەر ئەوەی پاشماوەی و ئاسەواری زەق و دیار بە جێناهێڵن ، ڕەنگە ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا بەلای ئەوانەوە ناوچەیەکی نموونەی و هەڵبژاردە بێت ، یان لەبەر ئەوەی بێ کە نویکە لە گرنگترین ناوچەی پیشەازی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەوەش ناوچەی باکور خۆرهەلاتە .

کەواتە ناتوانرێت بە ووردی و بەدیاریکراوی مەبەستەکانی ئەو گەشتانە دیارییکرێت ، ئەوەی دەگوترێت ئەگەر ڕاو بۆچوونە کە گرتنگترینیان ئەمانەن :

أ :بەلای زۆر لەوانەی کە بایەخ بەم دیاردەیە دەدەن و لێکۆڵینەوەیان لەسەر کردووە ئەڵێن هۆی هەرە گەورەی ئەو سەردانە بۆ تاقیکردنەوە و زانینی ئەو ئاستە پێشکەوتنەیە کە دانیشتوانی سەر گۆی زەوی پێی گەیشتوون بۆ ئەوە ، زۆرینەی سەردان و گەشتەکانیان بۆ ناوچە ئاوەدان و ناوچە پێشکەوتووەکانە لە ڕووی پیشەسازییەوە ، ڕەنگە ئەو پاپۆڕ و فڕۆکانە کە دیار نامێنن لای ئەوانبن و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا بکەن [٣٨] .

ب. ژمارەیەك لێکۆڵەوە پێیان وایە ، سەردانەکانی ئەوتەنەفڕیوانە لە دوای پێشکەوتنە زانستی و تەکنولۆژییەکان کە مرۆڤی سەرگۆی زەوی بەدەستی هێناون و زۆر تر بون ، بەتایبەتی دوای دیاردەی گەشت بەرەو بۆشایی ، ئەوە وای لەو بوونەوەرە زیندوانەکردووە ، کە ترسیان لەوە هەبێت دەست مرۆڤی سەرگۆی زەوی بیانگاتێ و ببێتە مایەی ترس و هەڕەشە بۆیان [٣٩] .

ج. هەندێکی تر ڕایان وایە ئەو پێشکەوتنە گەورەیەی مرۆڤی سەر هەسارەی زەوی بە دەستی هێناوە ، دیاردەی پیسبونی لێدەکەوێتەوە ، بەتایبەتی پیسبوونی ئاو، گەر ئەو بوونەوەرانە لە ژێر ئاوی زەریاکانەوە بێت مافی Polution( التلوس)

خۆیانە لە پیسبوونی ئاوی دەریا و زەریاکان بترسن و کاربکەن بۆ ئەوی سنووریێ دابنێن بۆ ئەو پیسبوونە.

د.ژمارەیەکی کەم لێکۆڵەرەوە هەنە پێیان وایە سەرنشینەکانی ئەو تەنە فڕیوانە پاشماوەی دانیشتوانی سەر هەسارەیەکن ، لەبەرهەر هۆیەك بێت ئەو هەسارەیە لە ناو چووبێت ، ئێستا بۆ هەسارەیەك دەگەڕێن کە لەسەری نیشتەجێبن ، بەم سەردانانەیان دەیانەوێت هەست و کاردانەوەی مرۆڤی سەر گۆی زەوی بزانن کە ناچار بوون دابەزنە سەری و تێیدا نیشتەجێبن [٤٠] .

٤- دەشێ ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا بنکەیەکی سەربازی ، یان سیخوڕی بێت ؟

لە کۆتای هۆکارە مرۆییەکاندا ، پێمان باشە ئاماژەیەکی کورت بۆ بابەتێك بکەین کە نەك هەر لە ناو خەڵکی گشتیدا ، بەڵکو لە ناو ژمارەیەك ڕۆشنبیراندا باوو بلاوە ، ئەویش ئەویە کە ئەم جۆرە ناوچانە بنکەیەکی سەربازی یان موخابەراتی یان تاقیکردنەوە نهێنییەکان بن ، بۆیە ئەم هەموو نامۆی و سەیر و ئاڵۆزییە دەدرێنە پاڵیان تا کەسانێکی نەیار لێیان نزیك بێتەوە .

ئێمە ئەم ناوچەیە بە ناوچەیەکی نادیارلەو جۆرانەی نازانین لەبەر ئەم هۆیانە :

أ : هێشتا ئەم ناوچەیە بە شێوەیەکی ڕەسمی لە لایەن زۆرینەی دەوڵەتە دروسێکانەوە بە ناوچەیەکی مەترسیدار ، یان قەدەغە کراو لە قەڵەمنەدراوە ، هەتا ئێستاش کەشتی وا پاپۆڕ و فڕۆکە هاتو چۆی پێدادەکەن ، دەکرا وڵاتێکی وەك USA هەر لە بناغەداو بە ئاشکرا

بە ناوچەیەکی سەربازی قەدەغەکراوی لە قەڵەمبدایە و نەیهێشتایە پاپۆڕ وفڕۆکە و هیچ وولاتێکی بەناو بەسەردا تێپەڕێت بۆ وولاتێکی زلهێزی وەك ئەمریکا ، ئەمە کارێکی ئاسانە مەگەر بەرمۆدا خۆی کۆلۆنیالکی بەریتانییە ؟ دەکرا بەریتانیاش کارێکی لەو جۆرە ئەنجام بدایە .

ب. مردن و دیارنەمان و لە ناوچوونی ئەو ژمارە زۆرە لەسەر نشینانی ئەو پاپۆڕ و فڕۆکانە لەو ناوچەیەدا کارێکی هەروا ئاسان و ساکار نییە بە ئاسانی تێپەڕێت و وولاتانی خاوەن ئەو پاپۆڕ و فڕۆکانە لێی بێدەنگبن ، گەر ئەوەشمان زانی ئەو پاپۆڕ و فڕۆکانەی کە دیار نامێنن سەربە ڕەگەو ونەتەوەی جیاواز و وولاتی جیاوازان ، گریمان ئەو ناوچەیە بنکەیەکی سیخوڕی یان تاقیکردنەوە نهێنیەکانی ئەمریکا بێت بەو پێیە نزیکە لە ناوچەکەوە وولاتێکی زلهێزی وەك ئەمریکا خاوەن توانایە ، لە ڕووی پەیوەندی نێودەوڵەتی و هاوپەیمانێتی و ڕێسا و یاسا نێودەوڵەتیەکانە و ناتوانێت پاپۆڕ و فڕۆکەی وولاتانی وەك بەریتانیان و فەڕەنسا و ڕووسیا و ئەڵمانیا بشارێتەو ، چونکە ئەو دەزانن کە ئەوان کارێکی سیخوڕی دوژمنکارانەیە ،

ج. ئەو دەوڵەتە زل هێزانەی جیهان زۆرینەیان ڕووبەرێکی زەمینی گەورە و بەربلاویان هەیە دەتوانن ئەو دۆرە سەنتەرانە لە ناوەوی لێبێچینەوە بکەون ،

یان بە هەمان شێوە دەتوانن لەناو ئاوە هەرێمایەتییەکانی خۆیاندا ئەو دۆرە سەنتەرانە دا بمەزرێنن .

د. ئەوانەی ئەو پاساوانە دێننەوە ، رەنگە بۆ خۆقوتارکردن لە گەڕان و پشکنین بە دوای هۆکارەکانی ئەو دیاردەیەدا ، بەو بیانووە بێبناغە و پووچەڵانەی کە رەنگە زۆربەی کەس باوەڕیان پێنەکات .

## باسی دووەم

### ڕای ئەوانەی هەر لە بناغەدا باوەڕیان بە نامۆیی دیاردەکەنییە .

کۆمەڵێك پسپۆ و زانا ڕایان وایە ، ئەو دەریایەی دیارنەمانی پاپۆڕ و فڕۆکە ، کە لە ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدادا ڕوودەدات دیاردەیەکی ئاساییە ، هیچ نامۆیی و ناوەزەیی و سەرسوڕهێنی تێدانیە .ئەوانە پێیان وایە ئەو ئامێر وە سەرژمێریانەی لەم بارەیەو بلاّو کراونەتەوە ، ئەوە پێشاندەدەن کە هەمو ناوچەکانی سەر گۆی زەویدا ، بەناو ووشکانیەوە ، ڕوودەدەن سێگۆشەی بەرمۆداش بەشێکە لەم ناچانە .

لەم ڕووەوە دامەزراوەی زانیارییەکانی ( لویدز ) لە لەندەن و هەروەها ڕاپۆرتەکانی بەرێوەبەرایەتی پاسەوانانی سنورەکانی ئەمریکا ، ئاماژەی بەوەدا کە ژمارەی ئەو کەشتی و پاپۆڕانەی لە ساڵی ( ١٩٧٥ ) دا لە هەموو کەنارەکانی ئەمریکادا بزربوون ( ٢١ ) کەشتی و پاپۆڕ بوون ، تەنها ( ٤ ) لەوانە لە ناو ئاسۆی سێگۆشەی بەرمۆدادا بزربوون ، واتە بە ڕێژەی ( ٢٠٪ ) ئەمەش ڕیژەیەکی بەرز و ترسناك و ناوازەنییە ، هەر بە گوێرەی ئەو ڕاپۆرتانە لە ساڵی ( ١٩٧٦ ) دا ( ٢٨ ) کەشتی و پاپۆڕی ئەمریکایی بزربوون ، تەنها ( ٦ ) لەوانە لە ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدادا بزربوون ، بە ڕای ئەم کۆمەڵە ، ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا ناوچەیەکی پڕ جووڵەیە ، چڕیی کەشتیرانیی تێدا زۆرە ، ئاساییە کە ساڵانە ژمارەیەك کەشتی و پاپۆڕ تووشی ڕوودا و کارەسات بێن تیایدا .. هەر هەمان سەرچاوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لەم دە ساڵەی دواییدا ژمارەی ئەو فڕۆکانەی لەم ناوچەیەداکەوتوونەتە خوارەوە زۆر زۆر کەمبۆتەوە ( ٤١ ) .

بە کورتی ئەمانەی وای بۆ دەچن کە ئەو هۆکارانە دەبنە هۆی تێکشکان و کەوتنە خوارەوەی پاپۆڕ و فڕۆکە لەم ناوچەیەدا ، زۆرینەیان لە ئەنجامی

هۆکارە سروشتیەکانەوە بوون ، وەك تێکچوونی باری کەش و هەوای ناوچەکە ، شەپۆل و گەردەلوولی ناو ئەو رووبەرە ئاوییە . تەوژمە دەریاییەکان ، بە تایبەتی تەوژمی مەکیسکی گەرم ، کە ئەمانە زۆرینەی حاڵەتەکانی پێکدێن ، کە حاڵەتی ئاسایی و سروشتین .

یان دەشێ لە هەندێ حاڵەتدا هۆکاری مرۆی لە پشت ئەم دیاردانەوە بن ، وەك شارەزایی و لێهاتووی کەشتیوانەکان ، یان فڕۆکەوانەکان ، وەك هەڵە و ترس و دڵە ڕاوکێ و شڵەژان ، هتد ..

یان ڕووداوی دزی و تالآنی و ڕووتکردنەوە بوون ، بەلآم بۆ ئەو بابەتەی کە پەیوەندی بە دیارنەمانەو هەیە ، ئەمانە ڕایان وایە ئەو دیارنەمانە بە شێوەیەکی ڕەها ( مطلق ) نییە لە هەندێ حاڵەتدا پاشماوەی و سەرهەڵدانەوەی هەندێك لەو کەشتی و پاپۆڕ فڕۆکانە هەبووە ، ئەوانەشی کە هەر سەریانهەڵنەداوەتەوە ، هۆیەکەدەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی کە پاشماوەی ئەو کەشتی و پاپۆڕ و فڕۆکانەوە دەشێ هەر بە یەکجاری بکەونە ژێر لم و نشیتەی ئەرزەیانەوە ، ئەوەندە لم و نسشتەیان بکەوێتە سەر جارێکی تر سەرهەڵنەدەنەوە ، هەر لە هۆیە مرۆییەکانی ئەم یاردەیە گەورەکردن و زێدە رەوی هەیە لە باسکردنی دیاردەکاندا .

## پەراوێزەکانی بەشی پێنجەم


١. خالد حامد العرفى ،مثلث برمودا مقبرة الاطلنطي ، مصدر سابق ص١٠.
٢.د.عادل موسي الناحس ، ضارات سادت ثم بادت ، العلوم العدد الرابع تشرين الثاني ١٩٨٤ ص٧
٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٧
٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٧
٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٨
٦- محمد محمد أسماعيل ،مثلث برمودا بين الحقيقة واليخال ، مجلة العلوم العدد٧٥ سنة ١٩٩٤ ص٢٠
٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٠
٨. د. طالب ناهي الخفاجي / اسرار مثلث برمودا ، مصدر سابق ص٦٢
٩. د. ئازاد محمد أمين / جغرافية الامركيتين ، الموصل ١٩٨٥ ص٩٥
١٠. د. طالب ناهي الخفاجي ، أسرار مثلث برمودا، مصدر سابق ص٦٣
١١. خالد حامد العرفي ، مثلث برمودا مصدر سابق ٥١
١٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٥٣
١٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٩٥
١٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٩٦
١٥. مجلة " الافاق العملية العدد ١٦ كانون الاول ١٩٨٨ ( بدون أسم الكاتب ) .
١٦. د. على عبد الكريم ، علم الجغرافية الطبيعية ، بصرة ١٩٦٩ ص١٧
١٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢
١٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢
١٩. ينجل بلونديل و رۆجزيوور ، أعظم أسرار الاجسام الطائرة المجهولة ، العالم بغداد ١٩٨٨ ، ص٧

٢٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢١١
٢١- محمد رؤوف محمد أمین ، دفره فڕیوەكان گۆڤاری زانستی سەردەم ، ژمارە (١٥) ی كانوونی ٢٠٠٣
٢٢. خالد حامد العرفی : مثلث برمودا ، مصدر سابق ص٨٣
٢٣. د. أیمن أبو الروس ، مثلث برموجا ، مصدر سابق ص٧٣
٢٤. . هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٧٠
٢٥. . هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٦٦
٢٦. خالد حامد العرفي ، مثلث برمودا / صدر سابق ، ص٨٣
٢٧. ئەمە ناونیشانی توێژینەویەكە د.عادل موسی الناحس لە گۆڤاری( العلوم ) دا تشیرنی دووەمی سالی (١٩٨٤) بلاویكردۆتەوە لە بەر گرنگیی بابەتەكە و پەیوەندی بە دیاردەكانی بەرمۆداوەی ، لە بەشەكانی داهاتوودا هەندێكی دەخەینە ڕوو .
٢٨.د.طالب ناهی الخفاجي ،أسرار مثلث برمودا ، مصدر سابق ، ص٩٦
٢٩. . هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٠٤
٣٠. . هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٠٤
٣١. . هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٨٧
٣٢. . هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٠٨
٣٣. . هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١١١
٣٤. . هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١١١
٣٥. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە ، نیچل بلۆننویل و ڕۆجرزبوور ، أعظم أسرار الاجسام الطائرة ، مصدر سابق ١٦٩-١٧٧
٣٦. أسماعیل موسی مراد / ئازاد حەمە شریف ، بوونەوەرە هۆشمەندەكانی بۆشایی ئاسمان ،بغداد ١٩٨٩ ص٢٦

٣٧. . هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٢٠
٣٨. طالب ناهي الخفاجي ،أسرار مثلث برمودا ، مصدر سابق ، ص٧١
٣٩. . هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٧١
٤٠. نیچل بلۆندیل و رۆجرزبوور ، أعظيم أسرار الاجسام الطائرة مصدر سابق ص٢٢١
٤١. د . عبد المحصن صالح ، الاسنان الحائر بين العلم والخرافة سلسلة كتاب باء الشهر العدد (١) بغداد .٢٠٠١ ص١٠٢

## بەشی شەشەم

# هەندێك دیاردەی پەیوەندی دار بە سێگۆشەی بەرمۆداوە .

### پێشەکی /

وەك پێشتر باس لە هۆکارەکانی دیارنەمان ، بزربوون ، تێکشکان و ژێر ئاو کەوتنی ژمارەیەك پاپۆڕ وفڕۆکە کرا لە بارودۆخێکی ئاڵۆز و نادیاردا ،/ ئەو هۆکارانەمان گێرانەوە ، بۆ دوو کۆمەڵەهۆکاری سروشتی و مرۆیی ، بەلای ئێمەوە هۆکارە سروشتیەکان لاوازن و هەموو دیاردەکانی بە چۆنێتی ڕووداوەکانی پێلێکنادرێتەوە "، بۆیە هۆکارە مرۆییکان بە بەهێزتر و پەسەند تر دەزانن بۆ ئەو لێکۆڵینەوانە ، لەگەڵ ئەوەشدا لەم بەشەدا (٣) دیاردە دەخەینە ڕوو کە پەیوەندیدارن بە ڕووەکانی ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆداوە ، یەکێکیان سروشتیە پەیوەندی دارە بە کایەی موگناتیسیەوە دووانەکەی تریش مرۆیین پەیوەندیان هەیە بە بوونی ژیان و شارستانی لە بەشێکی تر ، یان ناوچەیەکی تری ئەم گۆی زەوییە ، جا لەژێر ئاوی زەریاکاندابێت ، یان لە ژێر زەوی و کەلێن و کەلەبەرەکانی جەمسەرەکاندا ، پێویستە ئەوەش بڵێین ئەو هۆکارە مرۆیاییەی ئێمە پاڵپشتیان لێدەکەین نەبوونەتە هۆکاری سەلمێنراوی حاشا هەڵنەگری یەکالاکەرەوە بۆ ئەو دیاردانە ، ئەوەی ئێمە ئەنجامێکە لە چۆنێتی و بارودۆخ و چوونە ناو ووردەکاری حاڵەتەکانەوە سەرچاوە دەگرێت ، ئەو دیاردانەش ئەمانەن :

## باسی یەکەم
## تاقیکردنەوەکەی فلادفیا

ئەم تاقیکدرنەوەیە سەرەتا وەکو بیرۆکەیەک ، یان پێشنیازێک سەرهەڵیداوە و دواتر بووە پڕۆژەیەک لە کۆتایشدا بووە تاقیکردنەوەیەک کە ئەنجامێکی گرنگ و بگرە مەترسیداریشی لێکەوتەوە سەرەتا پڕۆژەیەک بوو بۆ بەرگری ، نەک بۆ هێرش ئامانج یەکەمین و سەرەتاکانی ئەم تاقیکردنەوەیە بریتیبوون لە بەکارهێنانی کایە کارو موگناتیسییە بەهێزەکان بە تایبەتی بۆ دوورخستنەوە بۆمبە ئاراستەکراوەکان، یان ئەو توبیدانەی کە ئاراستەی پاپۆڕ و ژێر دەریاییش دەکران ، ئەویش بەوە دێتە دی کە کایەکی موگناتیسی بەهێز بەدەوری پاپۆڕەکەدا دروستبکرێت ، بەلام بە پەلە پڕۆژەکە گۆڕا بۆ پڕۆژەیەکی گۆڕینی تەنە بینراوەکان بۆ تەنی نەبینراو ، زانا و توێژەرەوەکانی نوسینگەی توێژنەوەی ئەمریکایی سەرەتا هیچ بیرۆکەیەکی دیاریکراویان نەبوو ، لەسەر ئەنجامی ئەو تاقیکرنەوەیە ، بەتایبەتی کاریگەرە لاوەکیەکانی لە ڕووی فیزیاوی سایکۆلۆجی و ژیرییەوە (١) زانا( د.موریس جیسۆب ) لەم بارەیە وە دەڵێت .... تاقیکردنەوەکەی فلادفیا تاقیکردنەوەیەکی نهێنی بوو ، بەشی هێزی دەریایی ئەمریکا لەسەر پاپۆڕێک ( مدمرە ) لە ساڵی (١٩٤٣) دا ئەنجامیاندابوو ، مەبەستیش لە تاقیکردنەوەکە دەرخستنی کاریگەری کایەی موگناتیسی بوو لەسەر پاپۆڕەکە ، بایەخی هەرە گەورەی ئەم تاقیکردنەوەییە لە وەدابوو ، کە مرۆڤیش لەسەر ئەم پاپۆڕە بوو ، ئەوانیش کەوتە بەر ئەو کاریگەریە ، ئەنجامەکەی سەیر و سەرنج ڕاکێش بوو ، هەر بە دەرکەوتنی کاریگەری تاقیرکردنەوەکە ، تەمێکی سەوزباوی دیار و ئاشکرا بە دەوری پاپۆڕەکەدا دروست بوو ، زۆر لەوە دەچوو کە ڕزگاربوانی ناوچەی سگۆشەی بەرمۆدا باسیان لێوەدەکرد، دواتر زۆر بە خێرای

پاپۆڕەکە بەسەر نشینەکانیشەوە دیارنەمان و لەبەر چاو بزربوون ، پاشان ڕاگەیەنرا کە تاقیکردنەوەکە سەرکەوتوو بووە ، دەرکەوت کە پاپۆڕەکە نگرۆنەبووە ، بەڵکو بە خۆیی و سەرنشینەکانیەوە لە چاو دیار نەماون (٢) د. ڤالنتین پێی وایە د.جیسۆب بە ڕاستی و دروستی ئەنجامەکانی تاقیکردنەوەکەی فلادفیای زانیون ، بۆیە چەند جارێك لەگەڵ سەرکردە دەریاییەکانی ئەمریکادا کۆبوونەوە ، ڕەنگە د.جیسۆب بناغەی زانستیەکانی تاقیکردنەوەی فلادفیا دۆزیبێتەوە ،ئەو تەفسیر و لێکدانەوەیەش بەهۆی بیردۆزەکەی ئەلبێرت ئنشتاینەوە بوو کە بە بیردۆزێکی یەکبواری دەناسرێت ، ڕەنگە ئەمە هۆیەك بوبێت بۆ کوشتنی د.جیسۆب نەك وەك ئەوەی کە بڵاوکراوەتەوە گوایە خۆی کوشتبێت [٣] .

پاش تێپەڕ بوونی دەیان ساڵ بەسەر تاقیکردنەوەکەی هێشتا لە تاقیکردنەوەیەك دەچێت کە لە چیرۆکە زانستیەکاندا ئەنجام دەدرێت ، ژمارەیەك لە زانایان و توێژەران لەسەر ئەم تاقیکردنەوەیان نوسییوە ، لەوانە( چالز بێرەلتر ، و لیبیا م مۆر ، گرای پارکەر) هەتا ئێستاش زۆر لەلایەنەکانی ئەم تاقیکردنەوەیە هەر بە نهێنی ماوەتەوە ، بەڵام ئەوەی تووشی سەرنشینەکانی پاپۆڕەکە هات زۆر مەترسیدار بوو، لەڕوومو کە دیارنەدەمان و دەردەکەوتنەوە ، یان دەبوورایەوە و لە هۆش خۆ دەچوون ، یان عەقڵیان لە دەست دەدا ، بۆیەهێزی دەریایی ئەمریکای تاقیکردنەوەکانی ڕاگشرتن ، یان وای ڕادەگیاند کە ڕاگیربوون ، چونکە ئەنجامەکانی لەسەر تەندروستی مرۆڤ مەترسیدار بوون [٤] .

ئەوەی پەیوەندی بەم تاقیکردنەوە هەیە ، هێڵی پەیوەندیشە لەگەڵ ڕووداوەکانی ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدادا ، چارلێز بێرلتز بەوە پێکەوە گرێدەدا ، کە بوونەوەری زیندووی ژیر هەیە لە توانایدایە ئەو بیرۆکەیە زۆر

بە زانستیانەوە و بە تەکنەلۆجیایـەکی زۆر پێـشکەوتوو تـر بـەکاربهێنێت ، کایەی موگناتیسی لەبار و دۆخی گونجاو بۆ ئەو پاپۆڕ و فڕۆکانە بڕەخسێنێت ، ئەوە بوونەوەرە زیندووە ژیرانـەش لـە ڕێگـەی تەنـە فڕیوەکانـەوە بگەنـە ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا ئەو کارانە ئەنجامدەن جا گرنگ نییـە لـە کوێـوە دێن و بۆ کوێ دەگەڕێنەوە [٥]

## باسی دووەم

## بیرۆكەی كلوریتی زەوی - فكرة الارض الاجوفاء

بیرۆكەی بوونی جیهانێكی تر لە ژێر ، یان لە هەناوی زەویدا ، بیركەیەكی كۆنە لە چیرۆك و ئەفسانە كۆنەكاندا ئاماژەیەكی زۆر بۆ ئەم بیرۆكەیە هەیە ، دەستنووسە كۆنەكانی فیرعەونەكانی میسر و چینییە كۆنەكان ،ــ بەڵگەنامەكانی هیند یە دێرەكان ـ تەنانەت هەندێكی كەم لەلای ئەسكیمۆكان و دانیشتوانە ڕەسەنەكەی بانی تیب ، زۆر لەو چیرۆك و بابەتانەیان تێدایە ئەفلاتوون لە نوسینەكانیدا باس لە ( تونیلی پان و تونلیی تەسك ) لە هەناوی زەویدا دەكات ( ٦ ) لە زانیارییە ئاینەكانی بووزیدا باس لە جیهانێكی شاراوە دەكرێ لە ژێر زەویدا ، كە بە ( ئاگارتا ) ناویدەبات و دەڵێت لەو شوێنانەدا ملیۆنەها مرۆڤ لەبەهەشتێكی شێوە یەكسان دەژین ، جاربەجار نامە و پەیامیش دەنێرن بۆ دانیشتوانی سەر گۆی زەوی (٧) .

بێگومان ئەمانە چیرۆك و ئەفسانە و هیچ بناغەیەكی زانستی و بەبەڵگە سەلمێنراویان لەگەڵ دا باسنەكراوە ، بەلام مرۆڤی سەر ئەم گۆی زەوییە هۆشیار كردۆتەوە كە هەمیشە لە بیری ئەوەدا بێت ئایا ئەگەر تواناكانی ژیان هەیە لەو بەشە قوولاییەی هەناوی زەویدا ؟!

لەم سەردەمەشدا بیرۆكەیەكی هەبوونی ژیان و شارستانی لە هەناوی زەویدا ، هێشتا هەر بیرۆكەیەكی پەسەندە ، بۆیە مرۆڤ لەدوای شۆڕشی پیشەسازی و دوای داهێنانی ئامێر و دەزگای زۆر پێشكەوتوو ، كات و خەرج و كەسانی پسپۆڕی بۆ ئەم مەبەستە تەرخان كردوون ، بۆ ئەنجامدانی لێكۆڵینەوە و بەدوا گەڕانی ئەو كەلێن و تونێلانەی لە ئەفسانە و چیرۆكە كۆنەكاندا باسیان لێوەكراوە ، گەر بە بیرۆكەیەكی بۆش و بێبایەخیان بزانیایە هەڵبەت

ئەو کارانەیان ئەنجامدەدان ژمارەیەك لێکۆڵنەوەی چڕ و پڕ و هەمەلایـەنیان لەسەر ئەم بابەتە کردووە ، تا ئـەو ڕادەیـەی گریمانـە و بیردۆزیـان لەسـەر داناون لایەنگر و پشتگیریەکەی زۆریشی بۆ دروستبوون ..

یەکێك لە مامۆستایانی زانکۆی کامبردج کە ناوی ( پۆڵ لۆرانس ) ە بیردۆزێکـی لەم بارەیەوە داناوە ، کە چەمکەکەی ئەوە دەگەیەنێت ، ئـەو زەوییـەی ئێمـە لەسەرین پتە و و پڕ توندو تۆڵ نییە ، بەڵکو هەروڵە یان بۆشایی تێدا هەیە ، دەتوانرێت لە ڕێگای ئەو کەلێن و تونێلانەی جەمسەری بـاکوور و جەمـسەری باشوورەوە پەیوەست بکرێت بەو جیهان و شارستانییەتانەی کەلە وێدا هـەن ، ئـەم زانایـە دەڵێـت تیـشکی خـۆر لـە ڕێگـای ئـە کەلێنانـەی لـە هـەردوو جەمسەرەکەدا هەیە دەگاتە ئەو بەشانەی ناوەوە ، لـەدوای ئـەم کەلێنانـەوە زەویی پانوبەرین هەیە ، گەرمە و ڕوناکیش بـەر دەکـەوێت ، لـۆرانس دەڵێـت ڕووبەری وا پانوبەرینی تێدایە بە ئەندازەی ڕووبەری ئەمریکای باکوور دەبێت [٨] .شایەنی باسە ژمارەیەکی زۆر لێکۆڵینەوە و بلاوکـراوە و کتێـب لەسـەرئەم بابەتە بلاوکراونەتەوە ، نوسەری بەناوبانگی ئەمریکایی ( ویلیام ڕیـد ) لـە ساڵی ( ١٩٠٦ ) دا بابەتێکی لەم بارەیـەوە داناوەکـە بـەری ڕەنجـی( ٢٠ ) سـاڵ لێکۆڵینەوەییوو لەسەر ئەم بابەت ـ زانای ئەمریکایی ( د . ریمۆند بێرنـارد ) بە وردی ئەنجامەکانی ئەو نێـردراوە ئەمریکاییـەی ڕوونکردۆتـەوە کـە نێـر درابوون بۆ ئەم دۆزینەوە جوگرافیاییە ، ئەو نێـردراوە ئەمریکاییـە بـۆ ئـەم مەبەستە نێردرابوو ، بەسەرۆکایەتی ئەدمیراڵ (( ڕچـارد ا بییـرد ) بـوو کـە یەکێکبوو لە گەورە ئەفسەرانی هێـزی دەریـایی ئـەمریکا ، ئـەم نێردراوانـە دووگەشتیان ئەنجامدان ، گەشتی یەکەمیان لـە سـاڵی ( ١٩٤٧ ) دا بـوو . کـە ماوەی ( ١٧٠٠ ) میل لەو بەر کەلێنەی جەمسەری بـاکووردا چـوونەتە نـاوەوە ، واتە نزیکەی ( ٧ ) سەعات بە فڕۆکـە ئـەو کاتـە ، گەشـتی دووەم لـە سـاڵی

( ١٩٥٦ ) دا بوو لە گەشتێکی وەك ئەوەی یەکەمدا ، بەلاّم ئەمیان ماوەی ( ٢٣٠٠ ) میل بەجەمسەری باشووردا چوونەتە ناوەوە ، د. ڕیمۆند ئەم زانیارییانەیلە کتێبەکەدا بلاّ کردۆتەوە و بە وێنە و بەڵگە سەلماندنی [٩] .

زانای ئینگیزی ( پۆل لۆرانس ) نەك هەر خۆی ئەم دیاردەیە دەسەلمێنێت ، بەڵکو جەختیش لەسەر ئەوە دەکات کە هەردوو حوکمەتی ئەمریکا و بەریتانییاش ئەوە دەزانن کە بوونەوەری زیندووی زۆر پێشکەوتووی خاوەن شارستانی لەوەی مرۆڤی سەر زەوی پێشکەوتوتر ، لە هەاوی زەویدا هەیە ، بەلاّم باس و لێکۆڵینەوەکانیان بە نهێنی هێشتوونەتەوە و پەردە پۆشیاندەکەن [١٠] .

ئەوەندەی پەیوەندی بەباسەکەی ئێمەوە هەیە ئەوەیە گەر تەنە فڕیوەکان کاری دیارنەمان و بزرکردنی ئەو پاپۆڕ و فڕۆکانە ئەنجامبدەین ، ئەو ئەگەری ئەو زۆرە کە ئەو تەنە فڕیوانە لە ناو هەناوی زەوییەوە بێنە سەر زەوی ( ١١ ) ئەویش لە ڕێگای ئەو کەلێنانەوە لە هەردوو جەمسەرەکاندا هەن .

دوای ئەوەی ئەنجامەکانی گەشتەکەی ئەدمیراڵ بێرد ڕاگەیەنران ژمارەیەکی زۆر لە نووسەر و توێژەروان پشتگیریان لە هەردوو بیرۆکەکە کرد ، بیرۆکەی هەرۆڵیی زەوی و بیرۆکەی هاتنی تەنەفڕیوەکان لەو کەلێنانەی جەمسەری باکور و جەمسەری باشوورەوە ، لەوانە نووسەری بەڕازیلی ( و . س هیوجنین ) وە ( ف . أمادیۆن جیانین ) وە زانای ئەمریکای ( د. ریموۆند براند ) [١٢]

## باسی سێیەم
## ئەتلانتس ، یان کیشوەرە بزر بووەکە

**پێشەکی :**

شێوەی دابەش بوونی ئاو ووشکانی لەسەر گۆی زەوی هەروەها ڕووبەر و قەبارەی دەریا و زەریاکان تەنانەت ژمارەکانیشیان لە گۆڕاندا بوون و بەردەوامیش لە گۆڕادا وەك چۆن دیاردە جیمۆر فۆلۆجییەکان و تۆپۆگرافییەکانی سەر گۆی زەوی لە گۆڕاندان ، لەسەر چۆنێتی ئەو گۆڕانانە و جارەکانی ڕوودانی ئەو گۆڕانانە ، هۆیەکانی و ئەنجامەکانی ، ژمارەیەك زۆر گریمانە و بیردۆز سەریانهەڵداوە ، یەکێك لەو بیرۆزانە کە بەلای جوگرافیانەکانەوە گرنگە ، بیردۆزێکەوە بەناوی بیردۆزی - ترازانی کیشوەرەکان – نظرية زحزحة القارات –
Drifting-contints
کە زانای ئەڵمانی ( ئەلفێر ڤاگنەر ) دایناوە، بە گوێرەی ئەم بیردۆزەی ڤانگەر هەموو ئەو کیشوەرانەیکە ئێستا و بەم شێویە کە هەن لە چاخە جیۆلۆجییەکۆنەکاندا یەکپارچە ووشکانی گەورەبوون کە بە بارستەی Penge ناسراون ، تەنها یەك رووبەری ئاوی گەورەش هەبووە ، ئەویش بە دەریای ( تێس ) ناسراوە ، پاشان ئەو باراستاییە گەورەیە لە بەر هەندێ هۆکار ( کە لێرە بواری باسکردنیان نییە ) پارچە پارچە بوون و دواتر ترازاون و لە یەکتر دورکەتوونەتەوە ، پاشان ئەو شێوەیەی ئێستایان وەرگرتووە ، ڤاگنەر کۆمەلێك بەڵگەی زانستی هێناوەتەوە بۆ سەلماندنی بیردۆزەکە[١٣] .

گەر بە ووردی سەرنج لە نەخشەی ژمارە ٥- بدەین ، ئەو نەخشیەی کە جیۆلۆجییەکان بۆ جیهانیان کردووە ، ئەویش بە شێوەیەکی نزیککراوەیی لە

چاخی کەمبریدا دەردەکەوێت ، چۆن کیشورەکانی ئاسیا و ئەوروپا و ئەفریقا و ئوسترالیا هێشتا هەر بەدەم یەکەوە بوون .
بەلای جیۆلۆجییەکان و جوگرافیازانەکانەوە ئاشکرا و زانراوە کە لێرە و لەوێ و لە چاخە جیاوازەکاندا دوورگەی بچووك و مامناوەندی ژێر ئاو دەکەون ، یـان وشکانی نوێ لە ناو ئاوی رووبەرە ئاوییەکاندا دەردەکەون ،دەشێ ئەم گۆڕانانە لە ماوەیەکی کورتـدابن ، وەك ئەوانـەی کـە لـە جوولـە تەکنۆنییەکانـەوە ڕوودەدەن ، یان درێژخایەن بن ، وەك ئەوانەی کە لە جوولە تەکنۆنییەکانەوە ڕوودەدەن ، کەواتە ژێر ئاو کەوتن یان بەدەرکەوتنی و شکانی ئەتلانتس ، یان وەك باوەکـە دەگـوترێ بزربـوونی ئـەتلانتس ، بابەتێکـە لـەو جـۆرە ژێـر ئاوکەوتنەبە جیاوازی ئەوەی کە ڕووبەری ئەم دوورگەیە ، یان ئەم کیـشوەرە ، زۆر گەورە بووە لە چاو دورگە ژێـر ئـاو کـەوتووەکانی تـردا ، هـەتا ئێـستا هەزاران لێکۆڵینەوە و بلاوکراوە و کتێـب و لەسـەر ئـەتلانتس نوسـراون ئـەو بابەتە هەمە جۆرانەیان داونەتە بەرباس و لێکۆڵینـەوە ، وەك ئـەوەی ئایـا شوێنی جوگرافیی ئەو کیشوەرە کوێبووە ؟ چی بەسەر هاتووە؟ هۆکارەکانی ژێـر ئاوکەوتن چیبوون ؟ ئایـا ئـاوەدانبووە یـان نـا ؟ وەکـو کۆمـەڵێك پرسـیاری ترئەوەنـدەی پەیوەنـدیان بـە باسـەکەی ئێمـەوە هەیـە ، ئەوەیـە چ پەیوەندیـەك هەیـە لـە نێـوان دیاردەکـانی ناوچـەی سێگۆشـەیبەمرۆدا و کیشوەری ئەتلانتی ونبوودا ، سەرەتا مێژووی جیۆلۆجیا ئـەوەی سـەلماندووە ، کە بارستایی گەورە هەبووە بە ئەندازەی بارستای کیشوەرێك دواتـر ژێـر ئـاو کـەوتووە و دیـار نـەماوە ، یـان پارچـە پارچـە بـووە یـا زۆر لـە یـەکتر دوورکەوتوونەتەوە ، لەوانە ( کیشوەری جەمسەری باشـوور کـە لـە بـاکووری ئـەمریکای بـاکوور و بـاکوری ئاسـیادا بـووە ، هـەتا دوورگـەکانی هینـدی

خۆرلاهەلات درێژ بوتەوە . کیشوەری گۆندوانا ، کە لە خۆرهەلاتی بەرازیلەوە درێژ بۆتەوە هەتا هندستان و ئوسترالیا ) .

## کیشوەرە بزربووکەی ( ئەتلانتس )

ئەتلەنتا کیشوەرێکبووە لە زەریای ئەتلەسیدا ، بڕوانە نەخشەی ژمارە ( ٥ ) لە ڕێگای ڕووداوێکی سروشتیەوە کە هەتا ئێستا بە تەواوی نەزانراوە ، ڕۆچووە و ژێر ئاو کەوتووە ، لە دوو تونی کتێبەکۆنەکاندا باس و وەصفی زۆر و بگرە خەیالی ئەفسانە ئاساهەیە لەسەر کیشوەری ئەتەلەنتا ، فەیلەسووفی گەورەی گریک ( پلاتۆ ) لەو کەسە یەکەمییانە بووە کە لەسەر ئەم کیشوەری نوسیوە ، ئەمەش لە سالەکانی ( ٣٥٥ ) پ .ز دا پلاتۆ لە دوو کتێبی جیاوازدا وەسفێکی وردی کیشوەری ئەتلانتای کردووە ، سەرچاوەکانی ئەو ساکەی گریک ، کە ناوی Solon بوو وەدەگرتوون ، ئەو کوڕە گریکە خوێنکارێبوو لە شاری ( تیبە ) ی پایتەختی فیرعەونەکانی میسر خوێندوویەتی ، ئەو خوێنکارەش ئەو زانیارییانە لە پیاوە ئایینەکانی میسرەوە بیستوون ، پیاوە ئایینییە کۆنەکانی میسر دەلێن .. ئەو شارستانیتیەی ئەوانە بوونیاتیاننـاوە ، کە جێگەی سەرنجی هەموو جیهانە لە کۆندا و ئێستاکەش ، لە شارستانێتی ئەتلەنتاوە ، وەرگیراوە ، کە ڕەنگە تەنها بەشێکی کەمی ئەو پێشکەوتنەشبێت [١٥]

پلاتۆزۆربە درێژی باس لە لایەنە مادییەکانی ئەو شارستانێتیەیە دەکات ، وەك ئەوەی لە ناو مالەکاندا ئاوی سارد و گەرمیان هەبووە ، تەلار و ڕێگاوبان و پرد و باخچە و جۆگا و ئاودێریان درووستکردوون . سوپای بەهێز و گەلەکەشتی و پەرستگەی زۆریان هەبوون [١٦] .

ئەفلاتونیش لەو کەسانە بووە کە دەربارەی کیشوەری ئەتلەنتای نوسیوە ، ئەویش ئاماژە بۆ ئەوە کردووە کە زانیاری لە پیاوە ئاینییەکانی میسری کۆنەوە وەرگیراون ، لە دوای ئەوانیشەوە هەتا ئێستا بە بەردەوامی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لە سەر ئەم کیشوەرە دەکرێت ، زانای بەناوبانگ ، ئیکناتیۆس دۆنیکس کە خاوەنی کتێبە بەناو بانگەکەی ( جیهانی پێش تۆفان ) ە کە لە سالی ( ١٨٨٢ ) دا بلاویکردۆتەوە ( ١٣ ) گریمان ( فریضة ) لەسەر کیشوەری ئەتلانتیس نوسیوە لەوانە ، ( ئەتلانتی یەکەمین لانکەی شارستانێتی مرۆڤبوویێت ) لە نوسینە کۆنەکانی فیرعەونەکانی میسردا گەلێ بیرۆکە و ئاماژاە هەن بۆ ئەوەی کە دانیشتوانی کیوشەری ئەتلانتس خۆریان پەرستووە . گریمان ئەوەی باسکردووە کە ئەتلانتس بەهۆی کارەساتێکی سروشتیەوە ژێر ئاو کەوتووە [١٧] .

لەم سالانەی داویشدا ژمارەیەك زانا و پسپۆڕ کەوتوونەتە لێکۆڵینەوە لەسەر ئەفسانەو کۆنەکان و دەقە کۆنەکانی پەیوەندیدارەکانی بەم بابەتەوە ، بۆ ئەوەی پەیوەندیەك بدۆزنەوە لە نێوان ئەتلانتیس و زانستەکانی تری وەك جیۆلۆجیا و زیندەوەرزانی و زمانزانی .. هتد .

بەلام بۆچوونەکانی توێژەری سویسرایی ( دەنگین ) و هەردوو توێژەری ڕووسی ( شکلۆڤکسی وە کانزایڤ ) جیاوازن لە بۆچوونەکانی دۆنلی ، بەلام ئەو سێ توێژەرەوە ، بوونەوەری زیندووی ژێر لە بۆشاییەوە هاتوونەتە سەر زەوی و مرۆڤی ئەو ناوچانەیان بە ڤاکسینی زیرەکی کوتاوە [١٨] .

د. عادل الناحس لە توێژینەوەیەکدا بەناونیشانی ( شارستانێتی هەبوون سەریانهەڵداوە و دواتر لە ناوچوون ) ئاماژە بۆ ئەوەی دەکات کە هەتا ئێستا زیاتر لە ( ٢٠٠٠ ) کتێب لەسەر کارەساتەکەی ئەتلانتس نوسراون ، ڕەنگە باشترینیان کتێبی

The mystery of Atlantisبێت کـە ئەنـدازیارێکی جـوگرافی بـەناوی ( ئۆتۆماك ) ەوە نوسیویەتی، هەوڵیداوە بـە ڕێگـای زانـستیانە ورد و دور لـە خەیاڵ و ئەفسانە لەم دیاردەیە بکۆڵێتەوە ، ئەو تویژەوانەی لـەم داویانـەدا بڵاوکراوەتەوە ئەمە دەردەخەن کەلە ناوچـەکانی بـاکوری زەریـای ئەتڵەسـدا شتێك یان ڕووداوێکی سروشتی گەورە ڕوویداوە کە کاریگەرییـەکی جیۆلـۆجی و ئـاو هـەوای و مـرۆی گـەورەی لێکەوتۆتـەوە، بەڕادەیـەك هـەموو جیهـانی گرۆتۆتەوە [١٩]

لەم کوورتە باسەی لە سەر کیشوەری ئەتلانتس کردمان مەبەستمان ئـەوە بـوو لەلایەن هەندێ زانیـاری بەسـوود بدەینـە خوێنـەر لەسـەر ئـەو کیـشوەرە ، دیاردەکانی ناوچەی سێگۆشەی بەرمۆدا و هۆکارەکانی ئەو دیاردەیە ، ژمارەیەك نووسەر و لێکۆڵەرەوە جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە ئـەو تەنـە فڕیوانـە بـەر پرسن لـە ڕووداوەکـانی ناوچـەی سێگۆشـەی بـەرمۆدا لـەژێر ئـاوی زەریـای ئەتڵەسیەوە دێن ، بەڵگەش بۆ ئەوە لەم ساڵانەی دواییدا پاشماوی ژمارەیـەك خانوو بەرە و تەلاری زۆر گەورە و مەزن لەژێر ئاوی زەریـای ئەتڵەسـیدا و بـە تاییـەتی لـە ناوچـەی دوورەگـەکانی بـەهاما و بـەوردیتر لـە دەور و بـەری ( بیمینی ) یەوە ، ئەوە ئاماژە و نیشانەیە بۆ هەبوونی ژیان و شارستانی لەو ناچانەشدا پێش هەزاران ساڵ .

لەم بۆچوونەوە هەندێ لە زانایان پێیان وایە لە ژێر ئاوی دەریا و زەریاکاندا ئەگەری بونی شارستانێتی مەزنی زۆر پێشکەوتوو هەبێت ، جا بـە شـێویەبێت کە زیندەوەرانی ئاو خودی ئاوەکە خۆیێ گۆڕانیـان بەسـەردا هاتبێتـە ، یـان لەبۆ شـاییەوە هاتبنـە ژێـر ئـەو زەریایانـە و کردبێتیانـە وێـستگە ، یـان نیشتمانی خۆیان ، بەڕەچاوکردنی ئـەوەی کەئـەو بوونـەوەرە زیندووانـە زۆر ژیـرن ، خـاوەنی شارسـتانێتی زۆر گـەورە و پێـشکەوتوون ڕەنگـە لـە

تواناشیانداهەبێت کە درێژە بە ژیان و شارستانێتی خۆیان ، تەنانەت لەناو ئاویشدا لەبەر هەر هۆیەك کە خۆیان بەلایانەوە گرنگە ئەنجامی بدەن ( ٢٠ ) ، سەبارەت بەو بابەتەی کە ئایا مرۆڤ دەتوانێ وەك ماسی لە ژێر ئاودا بە ئۆکسجینی تواوەی ناو ئاو بژی لەم دواییانەدا توێژنەوەیەك بلاو کراوەتەوە کە دووزانای ئەمریکی ( ژن و مێردێك ) بەناوی _ جوزێف بۆ فاشوورا و خێزانەکەی ) لە زانکۆی دیوکی ویلایەتی کارلینای باکوور ، توانیان مادەیەك دروست بکەن لە توانایدایە برێکی یەکجار زۆر ئۆکسجینی ناو ئاوەکە رابکێشێت کە بەهۆی ئەو برە زۆرە ئۆکسجینەوە مرۆڤ دەتوانێ ماوەیەکی زۆر لە ژێر ئاودا بمێنێتەوە ، ماددە نوێیەکە تێکەڵیەکە لە مادەیەك کە لەناو خوێندا هەیە لەگەڵ جۆرێك لە پلاستیکی نەرم ئەو دوو داهێنەرە ماددیەکەیان ناوناوە ( هیمۆسپۆنج ) نیوەی یەکەمی ناوەکەی بە واتای هیمۆگلۆبین دێت کە بەرپرسە لە گوواستنەوەی ئۆکسجین بۆ هەموو بەشاکانی لەشی مرۆڤ و نیوەی دووەمی ناوەکەی واتای ئسفەنج دەدات ، ئەم دووزانایە دەڵێن ئەم ماددە نوێیە کاری کەوانەی ریشەدارەکان دەکات لەلەشی ماسیدا ، شایەنی باسە ئەم ماددە نوێیە هەتا ماوەی حەوت ساڵ توانای کارکردن و راکێشانی ئۆکسجینی ناو ئاوەکەی هەیە ( ٢١ ) .

گەر ئەوە رەچاو بکرێت کە ئەو بوونەوەرە زیندووی ناو ، یان ژێر ئاوی زەریاکان پێشکەوتوتربێت لە مرۆڤی ئەم سەردەمەی سەرگۆی زەوی ، ئەی بۆچی لە توانایدا نەبێت داهێنراوی لەوەش پێکشەوتریش دابهێنێ !؟

پەراوێزەکانی بەشی شەشەم

١ )خالد حامد العرفى، مثلث برمودا مقبرة الطلنتطى ،،مصدر سابق ص٩٧

٢ ) د. طالب ناهى الخفاجى ، أسرار مثلث برمودا ، مصدر سابق ص٩١

٣ )بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە کوشتنی یان خۆ کوشتنی د.جیسۆب بڕوانە خالد حامد العرفى ، مثلث برمودا مقبرة الاطلنطس ، مصدر سابق ل٩٢

٤ ) هەمان سەرچاوەی پێشوو س٢١٧

٥ )مجدى محمد الشهاوى ، الاكباق الطائرة و مثلث برمودا بين الحقيقة و الخرافة مصدر سابق ص٦١

٦ ) ينميل بلونديل ورزوجرز بور ، أعظم أسرار الاجسا الطائرة المجهولة في العالم المصدر سابق ص٢١٧

٧ ) ٤ ) هەمان سەرچاوەی پێشوو س٢١٧

٨ ) خالد حامد العرفي ، مثلث برمودا مقبرة الاطلنطي ،مصدر سابق ص٨٢

٩ ) ٤ ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٨٣

١٠ ) هەمان سەرچاوەی پێشوو س ل ٨٤

١١ ) يفنجيل بلونديل و روجربور ، أظم اسرار الاجسام الاطائرة المجهولة في العالم مصدر سابق ص/٢١٩

١٢ ) خالد خامد العرفي مثلث برمودا مقبرة الاطلنطى ، مصدر سابق ص٨٧

١٣ ) بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە أ.د عبدالهادى يحى الصائغ و أ.د فاروق صنع الله العمرى ، الجيولوجيا العامه ، موصل ١٩٩٩ص٢٣٢

١٤ ) محمد محمد العيدان ، العالم حقائق وارقام ١٩٧١ ( بدون مكان الطبع ) .

١٥ ) د. عادل موسى النحاس حضارات سادت ثم بادت ، مجلة العلوم العدد الرابع ١٩٨٤ ص/٩

١٦ ) ٤ ) هەمان سەرچاوەی پێشوو س٥٥

١٧ )مجلة الالف باء ، العدد ٥٧٢ السنة الثانية عشر أيلول ١٩٧٩، ص/٥٤-٥٥( دون ذكر أسن الكتاب ) .

١٨ ) ٤ ) هەمان سەرچاوەی پێشوو س٥٥

١٩ )عادل موسى النحس الحضارات سادت ثم بارتا ، مصدر سابق ص/٩

٢٠ ) د. أيمن أبو الروس / مثلث برمودا ، مصدر سابق ص٧٤

٢١ ) مجلة العلوم / العدد العاشر أب١٩٨٥ ( هل يعيش الانسان كالسمكة ص/٤٠

( بدون ذكر أسم الكتاب )

# لیستی سەرچاوەکان .


١- سەرچاوە کوردیەکان .

١. محمد أمین ، محمد رووف ، دەفرە فڕیوەکان ، گۆڤاری زانستی سەردەم ژمارە (١٥) کانوونی دووەم ٢٠٠٣

٢. موسی مراد أسماعیل وەحمە شریف ئازاد بوونەوەرە هۆشمەندەکانی بۆشای ئاسمان ، بغداد ١٩٨٩

ب-المصدر العربية :

٣- اساعيل ، محمد محمد / مثلث برمودا بين الحقيقة و الخيال مجلة العلوم العدد (٧٥) /١٩٩٤ م .

٤- د. أبو الروس أيمن / مثلث برمودا مثلث الرعب الكوارث ، مكتبة أبن سينا القاهرة ١٩٨٩

٥- العرض خالد حامد / مثلث برمودا مقبرة الاطلنطي ، دار البشير القاهرة ١٩٩٣

٦- (بدون أسم الكتاب) مجلة الفاق العملية العدد ١٦ كانون الاول ١٩٨٨

٧-(بدون اسم الكتاب؟) مجلة الاولفاق العلمية العدد ٦ كانون الاول ١٩٨٨

٧- (بدون أسم الكتاب ( مجلة الالف باء ، العدد ٥٧٢ السنة ١٢ اليلون ١٩٧٩

٨- بلونديل ، نيضل ، بو ر، روجر ترجمة سعيد أحمد الحكيكم ، اعظم أسرار الاجسام الطائرة المجهولة في العالم ، بغداد ١٩٨٨

٩- د.االخفاجي طالب ناهي / أسرار مثلث برمودا ، مطبعة أسبيلة بغداد (بدون زمان الطبع) .

١٠- الشعيدان حمد محمود / العالم حقائق وأرقام / الطبعة الاول ١٩٧١

١١- الشهاوى مجدي محمد / الاطباق الطائةر و المثلث برمودا بين الحقيقة و الخيال مكتبة جزيرة الورود /١٩٩٥

١٢- أ.د الصائغ ، عبدالهادي ، وأدالعمرى فاروق صنع الله الجيلوجيا العامة موصل١٩٩٩

١٣ د. صالح عبدالمحسن الانسان الحائر بين العلم والخرافة سلسلة كتاب الف و باء الشهر العدد /بغداد ٢٠٠١

١٤- د. عبد الكريم على / علم الجغرافية الطبيعية ، دار الطباعة الحديثة الطبعة الاول بصرة ١٩٦٩

١٥- العلوم العدد ٧٥ سنة ١٩٤

١٦- محسن يولا / الجغرافية ، بيروت ١٩٩٩

١٧- د. محمد أمين م ئازاد / جغرافية الامركيين / موصل١٩٨٥

١٨- د. النناحس عادل موسى / مجلة العلوم / العدد الرابع ١٩٩٤

ج- بە زمانی فارسی :

مثلث برمودا/ چارليز بيرلتز ، ترجمەی محمد جواد پاکدل چاپی هەستم ،/ چاپخانەی علامة طباني پائيزه ١٣٤٩

٢٠-لە ئینتەرنێتەوە ( www. Foreitrea.8m.com )

٢١- مجلة العلوم / العدد العاشر ، أب ١٩٨٥ ( هل يعيش الانسان كالسمكة ) بدون ذكر أسم الكاتب /ص٤٠

٢٢- أطلس العالم ، محمد سيد نصر و أخرون لبنان طبعة جديدة ( بدون زمان الطبع ) .

٢٣- Philips , Modern School Atlas London 1984